ناوی کتێب: بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی
نووسینی: د. صباح بەرزنجی
ژمارەی سپاردن: (٢٢٢١) ساڵی (٢٠٠٨)
شوێنی چاپ: خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
نۆرەی چاپ: دووەم
ساڵی چاپ: ٢٠٠٨
نەخشەسازی بەرگ: فازل قەرەداغی
نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی
لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، زنجیرە (٤١)
ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com
ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكیی

ئاینی ئیسلام ئەو ئاینەیە كە خوای پەروەردگار بە سرووشی خۆی و لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرمان موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا ﷺ گەیاندوویەتی بە مرۆڤایەتی، دوو سەرچاوەی گرنگی ئیسلام بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی نەبەوی، كە دەبنە پێوەر و تەرازوو بۆ هەموو بڕیار و فەرمانێكی شەرعیی، هەر بڕیارێكی شەرعییش بەپێی پرۆسەیەكی فیكریی ژیرانە لە دووتوێی دەقەكانەوە وەردەگیرێت، لە لایەن كەسێك یان دەستەیەكی شارەزا لە زانستەكانی دینەوە، كە ئەمە بۆ خۆی بریتییە لە ئیجتیهاد، جا ئەم ئیجتیهادە ئەگەر دەستە جەمعی بێت پێی دەگوترێت (ئیجماع) و ئەگەر تاكەكەسی بێت بە (قیاس) ناوزەد دەكرێت.

كەواتە لە درێژەی (كیتاب) و (سوننەت) دوو سەرچاوەی تر دێنە ئاراوە، بۆ ئەوەی شەرعزانەكان بەكاریان بهێنن، بە مەبەستی دۆزینەوەی حوكمی شەرعی سەبارەت بە كار و چالاكیی و ڕووداوەكان.

لە بنەڕەتدا لە ناو مسوڵماناندا زانستێكی سەربەخۆ بە ناوی فیقە یان ئسوولی فیقە بوونی نەبووە، چونكە ئەوان ڕاستەوخۆ حوكمی شەرعییان لەسەر زاری حەزرەتی ڕەسوولی ئەكرەم ﷺ وەردەگرت و دوای وەفاتی ئەو دەگەڕانەوە بۆ لای یارە نزیكەكانی و ئەوانیش بە پێی ئایەتەكانی قورئان و ئەو ڕیوایەتانەی دەماو دەم لە پێغەمبەر ﷺ بۆیان مابووەوە، فتوایان بۆ دەدان و ئەگەر دەقێكی ڕاشكاویشیان لەسەر بابەتەكە لە بەردەستدا نەبوایەت، ئەوا ڕاوێژیان لەسەر دەكرد، سەرەنجام یان بە كۆدەنگ بڕیارێكیان لەسەر دەدا، یاخود بۆچوونی جیاوازیان لەسەر دەردەبڕی و هەر بۆچوونێكیش پاساوی خۆی هەبوویەت وەكو ئیجتیهاد و ڕایەكی فیقهی پاراستوویانەو دواتر بووەتە بەشێك لە كەلەپووری فیقهی ئیسلامیی.

دوای سەردەمی صەحابەی كیرام، سەردەمی تابیعین دەست پێدەكات، كە ئەمانیش درێژەپێدەری ئەوان بوون، لە شێوازی فتوادان و پەیوەستبوون بە دەق و چوارچێوەكانی ئیجتیهادەوە، بەو جیاوازییەی كە ئەمان دەرفەتێكی باشتریان بۆ رەخسا سەبارەت بە

شارەزابوون لە ریوایەت و فەرموودەکان و بژاڤێکی راستەقینەی زانستی فەرموودە پەرەی سەند، کە دواتر ڕێی خۆشکرد بۆ فەقیهەکانی دواتر و دامەزرێنەرانی مەزاهیبی فیقهی، کە کۆشك و تەلاری فیقهو یاسای ئیسلامیی لەسەر بنەماکانی قورئان و سوننەت دابمەزرێنن. بۆیە لە ماوەیەکی ستانداردا توانییان لە هەموو بوارەکانی ئایندا گەنجینەیەکی گەورە و گران لە فتوا و ئیجتیهاد بەرهەم بهێنن، کە پڕ بوو لە بیر و بۆچوون و داهێنان.

یەکێك لەو داهێنانە ناوازانەی زانا مسوڵمانەکان، لە بواری فیقه و یاسادا، بریتییە لە زانستی ئسووڵی فیقه، کە لە لایەکەوە بەرهەمی هۆش و ئاوەزی گەورەزانایانی وەك ئەبوحەنیفە و ئەبویوسف و مالیك و شافیعی و ئەحمەد و ئەوزاعی و...، لە لایەکی ترەوە بەرەنجامی گەشەسەندن و فراوانبوونی موناقەشاتی فیقهی و فیکریی ناو کۆمەڵگای مسوڵمان بوو.

ئەم زانستە لە سەرەتادا تەنها چەند یاسایەکی مامەڵەکردنی ژیرانە بوو لەگەڵ دەقەکان کە پێشەواکان لە کاتی وانەوتنەوە و فتوادانیدا فێری شاگردەکانیان دەکرد، بەبێ ئەوەی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆی بکەنەوە، تا ئەو ساتە وەختانەی ئیمامی شافیعی لەسەر داوای عەبدوڕڕەحمانی کوری مەهدی، کتێبی (الرسالة)ی ئیملا کرد لەسەر یەکێك لە قوتابییەکانی بە ناوی (الربیع بن سلیمان). لەوە بە دوا ئەم زانستە بووە لوتکەی بیر و ئەندێشەی یاسایی لە ئیسلامدا، زانایان بە گرنگییەکی زۆرەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردووە و پەرەیان پێداوە. بە جۆرێك کە شان بە شانی گەورە بوونی باڵەخانەی فیقهی مەزهەبە جیاجیاکان، کۆشك و تەلاری (أصول فقه)یش باڵای کردووە و تەنانەت ڕادەی دوور و نزیکیی و راستی و ڕەوانیی فتوا شەرعییەکانیش بە پێودانگی ئەم زانستە پێوراوە و خودی زانستەکەش بووەتە زانستێکی سەرەکی و بنەڕەتیی لە سیستەمی خوێندنی ئاینی هەموو گۆشەو کەنارێکی دنیای ئیسلام.

مێژووی زانستی (أصول) لە ریسالەی شافیعییەوە تا ئەمڕۆ بە چەند قۆناغێك دابەش دەکرێن. وەك قۆناغەکانی دامەزراندن و جێگیر بوون و پەل و پۆ هاویشتن و دواتر فراوانبوون و نوێگەریی، لەم قۆناغانەدا دەتوانین ئاماژە بۆ میتۆدگەلێکی جیاوازی ناو ئصولییەکان بکەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ میتۆدی موتەکەللیمین: ئەم میتۆدە بە شێوەیەکی ئیستدلالی و تیۆریی هەوڵی دارشتنی یاساکانی ئیجتیهاد دەدات، بە شێوازی زانایانی کەلام هەوڵی دانانی بنەمای ئیستینباطیان دەدا، بە بێ ئەوەی گوێ بدەنە ڕێکەوتن لەگەڵ بابەتە فەرعییەکاندا، واتە بە شێوەیەکی تەجریدی بێلایەن لە ئوصولی فیقھ دەکۆڵنەوە، لە ناو ئەمانەدا زانای موعتەزیلی و شافیعی و مالکی هەبوون، لە گرنگترین ئەو کتێبانەی لەسەر ئەم میتۆدە دانراون دەتوانین ئاماژە بۆ سێ کتێبی بنەڕەتی بکەین: یەکەم/ کتێبی (المعتمد) دانراوی أبو الحسنی بەصری موعتەزیلی (ك٤٦٣)، دووەم/ کتێبی (البرهان) هی ئیمام ئەلحەرەمەین (ك٤٧٨)، سێیەم/ (المستصفی) نوسراوی ئیمامی غەزالی (ك٥٠٥). دواتر دوو زانای گەورە هاتن ئەم کتێبانەیان بینی و پوختەیان کردن و کۆیان کردنەوە، یەکەمیان ئیمام فەخری رازی (ك٦٠٦) لە پەڕاوی (المحصول)داو دووەمیان سیف الدینی ئامیدی (ك٦٣١) لە کتێبی (الأحکام)دا. ئەم دوو کتێبە ناوبانگێکی باشیان پەیدا کرد، بۆیە زانایان هەستان بە کورت کردنەوە و پوختە کردنیان، بەتایبەتی کتێبی (المحصول) لە لایەن تاجەددینی ئەرمەوی (ك٦٥٦) کورت کرایەوە و ناونرا (الحاصل) و هەروەها لە لایەن مەحمودی ئەرمەویەوە (ك٦٧٢)، کە کتێبی (التحصیل)ی نووسیی، دواتر قازی بەیزاوی (ك٦٨٥) کاری لەسەر کتێبی (الحاصل) کردو ناوی نا (منهاج الوصول) کە کتێبێکی ئیجگار وردە و پێویستی بە لێکدانەوە هەیە و چاکترین لێکدانەوەش بۆی لە لایەن ئەسنەویەوە (ك٧٧٢) ئەنجام دراوە. کتێبی (الأحکام)یش لە لایەن ئیبنولحاجیبەوە (ك٦٤٦) کورت کرایەوە بە کتێبی (منتهی السؤل والأمل)، هەر خۆشی ئەم کتێبەی پوخت و پاڵفتە کردەوە بە ناوی (مختصر المنتهی)، کە کتێبێکی ئیجگار ورد و ئاڵۆزە و بە بێ شەرح نازانرێ و چاکترین شەرحێك کە لەسەری نوسرابێت هی عضدالدین الإیجی (ك٧٥٦) ژمارەیەکی زۆر حاشیەشی لەسەر نوسراوە گرنگترینیان حاشیەی تفتازانی (ك٧٩٢) و حاشیەی شریفی جورجانیە (ك٨١٦). هەموو ئەم کتێبانە لەسەر میتۆدی موتەکەللمین واتە لێکۆڵینەوەی وردی تیۆری نوسراوە.

٢ـ میتۆدی فەقیهە حەنەفییەکان: ئەم ڕێبازە بریتییە لە دارشتنی یاساکانی ئوصول بە ڕەچاوکردنی فتوا و بۆچوونە مەزهەبییەکان، واتە پابەند بوون بە ریوایەتی پێشەوایانی مەزهەب، تەنانەت ئەگەر یاسایەکی ئوصولی لەگەڵ ریوایەتێکی فیقهیدا نەگونجابا ئەوا

یاساکەیان دەستکاری دەکرد و وازیان لەو ریوایەتە نەدەهێنا. گرنگترین کتێب لەم بوارەدا بریتییە لە ئوصولی جەصصاص (ك٣٧٠) و ئوصولی ئەبو زەیدی دبوسی (ك٤٣٠) و ئوصولی سەرەخسی (ك٤٨٣). بەڵام باشترین کتێب هی فەخرولئیسلامی بزدەوییە (ك٤٨٣) کە عبدالعزیزی بوخاری (ك٧٣٠) شەرحێکی جوانی لێکردووە، لەناو موتەئەخخرینی حەنەفیشدا ئیمامی نەسەفی (ك٧٩٠) پەڕاوێکی پوخت و جوانی نوسیوە بە ناوی (المنار) کە شەرحی زۆری لێکراوە.

٣- میتۆدی موتەئەخخیرین: دوای ئەوەی زانایان سەیری دوو میتۆدی پێشویان کردو هەڵیان سەنگاندن بۆیان دەرکەوت هەرکامێکیان ئیجابیات و سلبیاتی هەیە، یەکەمیان ئەو ئیجابیاتەی هەیە کە لایەنگری مەزهەبێك و بۆچوونێکی دیاریکراو ناکات و تەنها لە ڕوانگەی بەڵگەوە بۆ یاساکان دەچێت، بەڵام ئەو تێبینیەی لەسەرە کە نموونەی پراکتیکیی کەم دەهێنێتەوە لەسەر یاساکان، هەرچی دووەمیشە ئەو ئیجابیاتەی هەیە کە نموونەی زۆرە، بەڵام ئەو ڕەخنەیەی لێدەگیرێت کە پابەندە بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە، بۆیە وایان بەباش زانی کە میتۆدێکی تازە کۆکەرەوەی ئەو دوانەی پێشوو دابڕێژن کە ئیجابیاتی هەردووکیانی تێدا بێ و بە دوور بێ لە سلبیاتیان، لە نموونەی ئەو کارانەی لەم ڕەوتەدا ئەنجام دراوە دەتوانین ئاماژە بۆ چەند کتێبێك بکەین، وەکو:

- (بدیع النظام الجامع بین کتابي البزدوي والأحکام) نوسراوی مظفر الدینی ساعاتی حنفی (ك٦٩٤).

- کتێبی (تنقیح الأصول) و شەرحەکەشی بە ناوی (التوضیح) نوسراوی صدر الشریعەی بوخاری (ك٧٤٧) کە تیایدا ئوصولی بەزدەوی و محصولی رازی و مختصری ئیبنولحاجیبی کورت کردۆتەوە، ئەم کتێبە حاشیەیەکی تەفتازانیشی بەسەرەوەیە.

- کتێبی (جمع الجوامع)ی (تاج الدین إبن السبکی) (ك٧٧١) کە وەك خۆی دەڵێت لە ڕووی (١٠٠) نوسراو و سەرچاوەی دیکەوە کۆی کردۆتەوە.

- کتێبی (التحریر) نوسراوی (کمال الدین ابن الهمامي حنفي) (ك٨٦١) کە لە لایەن (إبن أمیر الحاجی حلبي) (ك٨٧٩) شاگردی خۆیەوە شەرحی لێکراوە بە ناوی (التقریر والتحبیر).

١ـ میتۆدی دەرهێنانی فروع لە روانگەی ئوصوڵەوە: ئەم میتۆدە گرنگیی دەدات بە دەرخستنی جیاوازیی نێوان مەزهەبەکان بەپێی جیاوازییان لەمەڕ بنەما و یاسا ئوصوڵییەکان، لەو کتێبانەی کە لەم بوارەدا نوسراون ئەتوانین ئاماژە بۆ چەند کتێبێك بکەین، وەکو التمهیدی ئەسنەوی، تخریج الفروع علی الأصولي أبو المواهبي زەنجانی، القواعد والفوائد الأصولية دانراوی إبن اللحامی حنبلي.

٢ـ میتۆدی مەبەستگەرایی: ئەوەی کە سەرنجراکێشە لەم کاروانە دوور و درێژەی ئوصوڵی فیقه ئەوەیە کە کەسێك نەهات باس لەو بنەمایانە بکات کە یاسادانەر لە شەریعەتدا ڕەچاوی کردون و دەبنە بناغەی قیاس کردن لە ئەحکامی شەرعیدا، واتە ئەو مەبەستانەی خودی شەریعەت ڕوویان تێ دەکات و دەیانکاتە ئامانج پشتگوێ خرابوون و تەنها بە شێوەیەکی لاوەکیی لە دووتوێی باسی قیاسدا قسەی لەسەر دەکرا، تا سەرەنجام زانایەکی هەڵکەوتوو بە ناوی أبو إسحاقی شاطبي (ك٧٨٠) کتێبی (الموافقات)ی نووسی و ئەم کەلێنەی پڕ کردەوە، کە بە داخەوە ئەم کۆششە دوای ئەو درێژەی پێ نەدرا و وەکو مەنهەجێکی کلاسیك لە ناوەندەکانی خوێندندا جێی نەگرت، بەڵام ئەمڕۆکە وردە وردە خەریکە رەواج پەیدا بکات و دیراسەی زۆر و زەبەندی لەسەر بکرێت.

ئەم پەڕاوەی بەردەستمان هەوڵێکە بۆ باس و تێگەیشتنی هەندێك بابەتی بنەڕەتیی زانستی ئوصوڵ کە پێویستن بۆ خوێندکارانی قۆناغی بەکالۆریۆس لە بەشەکانی خوێندنی ئیسلامی و یاسای زانکۆکانی کوردستان و هەر خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی دیکەی گرنگی بە زانستەکانی فیقه و ئیسلامناسیی دەدات و مەبەستێتی لە باسەکانی ئەم زانستە ئاگادار ببێت. بەو هیوایەی توانیبێتم بەشێك و چمکێکی ئوصوڵ بە هاوزمانانم پێشکەش بکەم.

**د. سەباح بەرزنجی**

## پێناسەی ( أصول الفقە )

زانایانی ئوصولّ چەند پێناسەیەکیان داناوە بۆ (أصول الفقە) بەڵام هەموو پێناسەکان لە دەوری ئەم پێناسەیە کۆدەبنەوە واتە نزیکن لەم پێناسەیەوە ئەویش (أصول الفقه عبارة عن قواعد عامة يتوصل بها الى استنباط الأحكام الشرعية العملية الفرعية من ادلتها التفصيلية).

واتە: ئوصولی فیقه بریتییە لەو رێسا گشتییانەی کە بە هۆیەوە دەگەینە هەڵێنجانی ئەحکامی شەرعیی عەمەلی لە بەڵگە تەفصیلییەکان.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم پێناسەیە دوو زاراوە هەیە ڕوونی دەکەینەوە، ئەویش (الأحكام الشرعية العملية) لەگەڵ (ادلتها التفصيلية).

کە دەوترێ (الأحكام الشرعية العملية) واتە ئەو بڕیارانەی دراون لەسەر هەموو کار و کردەوەیەکی مرۆڤ وەك (واجب، مندوب، حرام، مكروه، مباح)، هەر کارو کردەوەیەکی تریش کە بەسترابن بە بڕیارێکی ترەوە واتە حوکمی وضعي وەك (السبب، الشرط، المانع، الصحة، بطلان).

هەروەها کە دەوترێ (الأدلة التفصيلية) بریتییە لەو حوکمە تایبەتییە بۆ ڕووداوێکی دیارییکراو یان هەڵسوکەوتێکی دیارییکراو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ) (الإسراء : ٣٣)، لەم ئایەتەدا (مجتهد) یان (قاضي) دەتوانێ استنباطی ئەوە بکات کە حوکمی کوشتنی ناحەق حەرامە.

هەروەها جیاوازیی لە نێوان هەردوو ووشەی (اجمالي) و (تفصيلي)دا، (اجمالي) واتە ڕوونکردنەوە نەك ووردکردنەوە بۆ نموونە کە دەڵێن بەڵگەمان (قورئانە) واتە کیتابە ئەمە بەڵگەیەکی روونکەرەوەیە، بەڵام کە دەڵێن تەفصیلی (واتە جزئي) واتە ووردکردنەوە.

بۆ نموونە کە دەڵێین فلان ئایەت ئەوا بەڵگەیەکی تەفصیلییە، یان نموونەیەکی تر ئەگەر وتت (سنة) ئەوە ئیجمالییە، بەڵام ئەگەر وتت فلان (حديث) ئەوا تەفصیلییە.

(فقە) ئیشی بە دەلیلی تەفصیلییە، بەڵام (أصول) لە ئەدلەی ئیجمالیی دەکۆڵێتەوە.

کەواتە لێرەوە دەتوانین بڵێین کە ئصولی فیقه دوو پێناسەی هەیە، پێناسەیەکیان هەردوو وشەی (أصول الفقه) پێکەوە دەکرێت کە پێی دەوترێ (علما لعلم مخصوص)، دووهەمیان کە

بەجیا واتە ئوصولْ بە جیا پێناسە دەکرێ پاشان فیقهیش بە جیا کە پێی دەوترێت پێناسەی (مرکبا اضافیا).

یەکەم: پێناسە بەپێی ئەوەی ناوی زانستێکی تایبەت بێت (باعتبارە علما لعلم مخصوص):

(هو العلم بالأدلة الإجمالية للفقه و بطرق الإستفادة منها و بصفات الشخص الذي يستفيد منها).

واتە: زانستت بەو بەڵگە ئیجمالیانەی فیقە و بە ڕێگای سوودوەرگرتن لێیان و خەسڵەتی ئەو کەسانەی کە سوودی لێ وەردەگرن.

کەواتە: أصول الفقه = الأدلة + النصوص + شروط المجتهد.

دووەم: پێناسە (أصول الفقه) بەپێی ئەوەی پێکهاتبێت لە أصول + فقه (بإعتبارە مرکبا اضافیا):

پێویستە لە پێشدا پێناسەی (أصول) بکەین پاشان (فقه).

یەکەم (الأصول) جەمعی (أصل) واتە کۆی (أصل)ە.

الأصل لغة: مايبنى عليه غيره (ئەوەی کە شتێکی تر لەسەری بنیات دەنرێ).

بەڵام لە (إصطلاح)دا واتە زاراوە لە شەریعەتدا چەند مانایەکی هەیە لەوانە:

١ـ بە مانای (القاعدة الكلية) دێ، نموونە: دەڵێین (الأصل ان الفاعل مرفوع)، (الأصل ان يد الأمان لاتضمن)، (الأصل ان العقد شريعة المتعاقدين).

٢ـ بە مانای (الدليل) دێ، نموونە: (الأصل وجوب الصلاة هو الكتاب)، (الأصل في تغريم المتسبب في الضرر هو القانون).

٣ـ بە مانای (الراجح) دێ، نموونە (إذا تردد النص بين الحقيقة و المجاز فالأصل هو الحقيقة).

٤ـ بە مانای (المستصحب) دێ، نموونە: (طهارة الماء هي الأصل)، (براءة الذمة في دعوى الدين هو الأصل: (أي الحالة التي نعود اليها).

٥ـ بە مانای (القاعدة المستمرة) دێ، نموونە: (أكل الميتة للمضطر خلاف الأصل) (خواردنی گۆشتی مردوو بۆ ناچار پێچەوانەی ئەصڵە) (تضمين الصناع خلاف الأصل)

(زەمانەتکردنی دروستکەر (جا ئەو دروستکەرە دارتاش بێ یان ئاسنگەر) پێچەوانەی ئەصڵە).

٦ـ بە مانای (المقیس علیه) دێ، نموونە: الجد یحجب الأخوة في المیراث و الأصل في ذلك هو الأب. (باپیر حجبی (منعی) برا دەکات لە میرات بەراوردکراو لەمەدا باوکە)[١].

و في حكم النبیذ الأصل هو الخمر واتە لە حوکمی شەرابدا بەراوردکراو عارەقە.

بەڵام ئێمە بۆ مانای ئوصولێ لە پێناسەکە مانای دووەم وەردەگرین ئەویش کە بە مانای (دلیل) دێ.

پێناسەی بەشی دووهەم لە (أصول الفقه) کە (فقه): ـ

الفقه: لغة: الفهم او الفهم الدقیق واتە فیقهـ لە زماندا بە مانای تێگەیشتن یان تێگەیشتنێکی وورد دێ، بەڵام (اصطلاحا) یان زاراوەیی: یان لە شەریعەتدا: هو العلم بالأحكام الشرعیة العملیة من الأدلة التفصیلیة.

ئەو زانستەیە بە ئەحکامی شەرعیی عەمەلییە لە بەڵگە تەفصیلییەکان.

بەڵام لە (قانون)دا: فیقهـ بریتییە لە لایەنی تیۆریی و بەڵگە هێنانەوە و شرۆڤە کردن، کە بۆ خۆی چەمکێکە جیاواز لە تەشریع و لە قەزا.

کەواتە دەتوانین بڵێین پێناسەی ئوصوڵی فیقهـ (هو العلم بالقواعد و الأدلة الإجمالیة التي بواسطتها یمكن استنباط الأحكام الشرعیة العملیة من ادلتها التفصیلیة) کە لە سەرەتادا باسمانکرد..

## الدلیل:

الدلیل في اللغة هو المرشد، لە زماندا بە مانای ڕێبەر دێ.

وە دەلیل لە لای زاناکان بە مانای (قول مؤلف من عدة قضایا یلزم من علم بها، العلم بقضیة جدیدة تسمی النتیجة او الحكم).

واتە وتەی (مؤلف) لە هەندێ ڕووداودا پێویستی دەکات لەسەری کە زانیاریی هەبێ پێی، زانست بە ڕووداوێکی تازە پێی دەوترێت دەرئەنجامی حوکم.

---

[1] ئەمە لای زانایانی مەزهەبی حەنەفی، بەڵام لای جمهور، باپیر و برا و خوشك بێبەش ناکات.

كە دەڵێین: (هذه المعاملة صحيحة) واتە ئەم معامەلەیە دروستە (وكل معاملة صحيحة لها اثر القانوني)، هەموو موعامەلەیەكی دروست ئەسەرێكی قانونیی لێ دەكەوێتەوە، كەواتە ئەم معامەلەیە ئەسەری قانونیی هەیە.

پێناسەی دلیل: اصطلاحا (ماكان له دخل (دور) في استنباط الحكم الشرعي). هەرشتێ دەوری هەبێ لە استنباطی حوكمی شەرعییدا پێی دەوترێ (دلیل) وە لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین:

یەكەم: دەلیلی شەرعیی یان دەلیلێكی ئەصڵییە یان دەلیلێكی تەبعییە.

دەلیلی ئەصڵی: هو منشئ الحكم أي لايوجد الحكم بدونه، وهو الكتاب و السنة، (بریتییە لە داهێنەری حوكم، واتە بەبێ ئەو حوكم دروست نابێ وەك كیتاب و سوننە).

دەلیلی تەبعی: هو الكاشف للحكم: ليس بالضرورة ان لايوجد الحكم بدونه بل يوجد الحكم دون ان يكون ظاهرا لنا و هو كالإجماع و القياس و سائر الأدلة.

دەلیلی تەبعی: بریتییە لە ئاشكراكردنی حوكمەكە، واتە ئەم حوكمەكە دروست ناكات، بەڵكو حوكمەكە خۆی هەیە، بەڵام ئەم ئاشكرای دەكات وەك ئیجماع و قیاس و دەلیلەكانی دیكە.

دووەم: دەلیلی شەرعیی بە گوێرەی مادەكەی سێ جۆرە:

١ـ الدليل النقلي. (دەلیلی نەقڵی)

٢ـ الدليل العقلي. (دەلیلی عەقڵی)

٣ـ الدليل المركب من العقلي و النقلي. (دەلیلێكی تێكەڵ لە عەقڵی و نەقڵی)

١) دەلیلی نەقڵی: برتییە لەوەی كە پشت دەبەستێ بە گێڕانەوە (نقل) وەكو (كتاب ـ سنة ـ إجماع ـ عرف ـ مذهب الصحابي).

٢) دەلیلی عەقڵی: بریتییە لەوەی كە پشت دەبەستێ بە (عقل)ی سەلیم وەكو (المصالح المرسلة ـ و الاستقراء و الاحتياط و القول بالبراءة).

٣) دەلیلێكی تێكەڵ لە عەقڵی و نەقڵی: واتە هەندێكی وەرگیراوە لە (نقل)، هەندێكی تر وەرگیراوە لە (عقل). وەكو (قياس ـ الإستحسان ـ الإستصحاب ـ سد الذرائع ـ شرع من قبلنا).

**١ـ الدليل الأصلي: وەك الكتاب و السنة.**

**یەكەم: الكتاب العزیز كە ئەویش قورئانی پیرۆزە.**

القرآن الكريم: (هو كلام الله تعالى، المنزل على الرسول محمد ﷺ المكتوب في المصاحف، المنقول عنه نقلا متواترا بلا شبهة، المبدوء بسورة الفاتحة و المختوم بسورة الناس، المتعبد بتلاوته).

بریتییە لە كەلامی خودا (الله)، نێراوە بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ نوسراوەتەوە لە (مصحف)دا، وەگێڕاوەتەوە لێی گێڕانەوەیەكی (متواتر) كە گومانی لەسەر نییە، دەست پێدەكات بە سوڕەتی (فاتحة) و كۆتایی دێ بە سوڕەتی (الناس)، خوێندنەوەی بە عیبادەت حساب دەكرێ.

**جۆرەكانی ئەو ئەحكامانەی كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون:**

لە قورئانی پیرۆزدا سێ جۆر حوكممان بەرچاو دەكەوێت:

١ـ حوكمی بڕوایی. ٢ـ حوكمی ئاكاریی. ٣ـ حوكمی كردەیی.

١) الأحكام الإعتقادية. ٢) الأحكام الخلقية. ٣) الأحكام العملية.

١) الأحكام الإعتقادية: هەرشتێك پەیوەندیی هەبێ بە بیروباوەڕەوە (العقيدة) وەك باوەڕ بوون بە خودا، باوەڕ بوون بە مەلائیكە (فریشتە)، باوەڕ بوون بە كتێبەكانی و باوەڕ بوون بە پێغەمبەران و باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی.

٢) الأحكام الخلقية: هەرشتێك كە ببینرێ لە مرۆڤدا یان وەصفی پێ بكرێ لە كردەوە باشەكان وەك: (صدق، عدل، شفقة، استقامة، و زانستی ئەخلاق گرنگی پێدەدات).

٣) الأحكام العملية: بریتییە لە هەموو ئەو ئیمورانەی كە پێویستە جێبەجێ بكرێ و ببینرێ لە عیبادات و معامەلات بە شێوەیەكی گشتیی.

ئەو ئەحكامە عەملییانەی كە لە قورئاندا هاتوون ئەمانەن:

١) الأحكام العبادات: ئەو ئایەتانەی كە باس لە عیبادات دەكات وەك: نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەكات بۆ بەهێزكردنی پەیوەندیی نێوان خودا و بەندەكانی.

٢) الأحكام الأسرة: برتییە لە دیاریكردنی واجب لەسەر كەسێك و ئەو ماف و ئەركانەی كە لە سەریەتی لەناو خێزاندا، وەك: زواج، طلاق، الحضانة، و الولاية، و التربية، نظام النفقات الوصايا.

٣) الأحكام المعاملات المالية: ئەو هێڵە گشتیانەی تێدا دیاریی دەکرێ کە پەیوەندیی هەیە بە موڵکییەوە، وەك: الحقوق الشخصية و چۆنێتی وفاء بالعقود و التزامات.

٤) الأحكام الدستورية: قورئان نەچۆتە ناو جوزئیاتی حوکمەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتیی باسی دەکات لەگەڵ ڕەچاو کردنی ئەم چوار بنەمایە:

أـ بنەمای یەکەم: کارکردنی بە (مبدأ شورى) لە هەموو بڕیارو جێبەجێکردنێکیدا (خوای گەورە دەفەرموێ: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (آل عمران : ١٥٩)، (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى : ٣٨).

ب ـ بنەمای دووەم: رەچاوکردنی (عەدل و عەدالەت لە هەموو حوکمێکی قەزائی و ئیدارییدا) خودای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ) (النحل : ٩٠) و (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ ...) (النساء :٥٨ ).

ج ـ ـ بنەمای سێهەم: دابەشکردنی حقوق و واجبات و ئیمتیازات لەسەر بنەمای یەکسانیی، داوای فرمانێك لە کەسێك نەکرێت لە سەرووی توانایەوە بێ، واتە توانای بەسەریدا نەشکێ: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا) (البقرة : ٢٨٦).

دـ بنەمای چوارەم: پابەند بوونی ئومەت (أمة) بە ڕێزگرتن لە دەسەڵات و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانیان لە سنوری شەریعەتدا، چونکە (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق).

٥) الأحكام الإقتصادية و المالية العامة: لە قورئاندا هەندێ ئایەت سروشتی چالاکیی ئابوریی روون دەکاتەوە لە زەویدا وەك: دیارییکردنی جۆری موڵکدارێتی و چۆنێتی گەڕانەوەی بۆ لای خودا..، هەندێ ئایەتی تر باس لە موڵکی گشتیی دەکات کە پەیوەندیی بە سامانی نەتەوایەتی و نیشتمانییەوە هەیە و باس لە چۆنێتی سوود لێوەرگرتن بە هۆی بەدەست هێنانی: زەکات و باج و ئەو زەویانەی کە ڕزگار کراون..

٦) احكام العلاقات الدولية: بریتییە لەو ئەحکامانەی کە پەیوەستن بە جەنگ و ئاشتی و ڕێکەوتن و معاهدات.

٧) احكام الجرائم و العقوبات: ئەو بڕیارانەی لەسەر تاوان و لادان و کارە زەشت و ناپەسندەکان دراون، تاوانەکانیش سێ جۆرن: ـ

* جرائم الحدود: ئەو تاوانەن کە هەڕەشەن لەسەر مەصاڵحی پێویستی ژیانی مرۆڤ وەك: زینا ـ دزی ـ حیرابە... هتد.

* جرائم القصاص و الدية: ئەو تاوانانەن کە مەترسیی دەخەنە سەر ژیانی مرۆڤ یان سەر سەلامەتی وەك: کوشتن.

* جرائم التعزیر: ئەو تاوانانەن کە وەلی ئەمر (ولي الأمر) یان دادوەر سزاکانیان دیاریی دەکات واتە ئەو کردەوە خراپانەی (نص)یان لەسەر نییە، وەك: رشوة و ....... هتد.

**دەلالەتی قورئان لەسەر ئەحکام:**

قورئان وەکو ئەوەی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە هاتووە بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ هیچ گومانێك لەسەر سەرچاوەی هاتن و وەرگرتنی نییە، لەو رووەشەوە کە سینە بە سینە و دەماودەم پەی دەر پەی بە تەواتور هاتووە هیچ گومانێك لەسەر سەنەدەکەی سەر ناگرێت، بۆیە زانایان تێکڕا بە قورئان دەڵێن: قطعي الصدور، بەڵام دەقە قورئانییەکان لە ڕووی مانادان بە دەستەوە دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١ـ قطعية الدلالة:

٢ـ ظنية الدلالة:

دلالة، واتە: بەڵگە یان ڕێنمایی.

بەڵگەی قورئان لەسەر حوکمە شەرعییەکان دوو جۆرە.

١ـ الدلالة القطعية: القطع هو اليقين.

اليقين: بریتییە لە بیروباوەڕێکی نەگۆڕ کە قابیلی گۆڕان نییە واتە ئەگەر شتێك (قطعي) بوو ئەوە مەجالی موجادلەی تێدا نییە و دەبێتە بەڵگە لە زاتی خۆیدا، نە پێویستی بە (إقرار)ە و نە بە (جعل)ە و نە بە وەزعی ترە.

کەواتە دەتوانین بڵێین دەلالەتی القطعي: بریتییە لەو دەقەی کە ماناکەی لە خودی دەقەکە خۆیدایە و پێویستی بە (اجتهاد یان تعدیل) نییە.

(نموونە لە شەریعەتدا).

أ) خودای گەورە دەفەرموێ: (فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ) (المائدة : ٦)، فاغْسِلُواْ دەلالەتی لەسەر شتنی دەموچاو (الوجە) لە دەستنوێژدا بەشێوەیەکی (قطعي)یە، بۆیە زانایان ئیختیلافیان نییە لەسەر حوکمی دەموچاو (الوجە).

ب) خودای گەورە دەفەرموێ: (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ) (النساء : ١٢)، دەلالەتی (نصف) لەم ئایەتەدا دەلالەتێکی قەتعییە.

ج) خودای گەورە دەفەرموێ: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ) (النور : ٢).

لەم ئایەتەدا عقوبەی زینا ئەگەر ئەرکان و شەرتەکان هاتنەدی ئەوا (١٠٠) جەڵدە، لەو کەسە دەدرێ و کەس بۆی نییە نە زیادی بکات و نە کەم واتە (قابل) نییە بۆ دەستکاری و گۆڕانکاری یان سووك کردنی سزاکە یان قورسکردن.

٢) الدلالة الظنية:

دەلالەتی (ظني) لەیەك مانا زیاتر هەڵدەگرێ واتە دەتوانرێ ئیجتهادو تەئویلاتی تێدا بکرێ، نموونە وەك: (وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ ...) (الأعراف : ٢٠٤ ).

* یان (لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة : ٢٢٦ ـ ٢٢٧).

المولی: ئەو کەسەیە کە (معاشەرەی زەوجیە) نەکات، واتە چوونە ناو جێگا لەگەڵ خێزانی مەنع دەکات بۆ ماوەی (٤) مانگ.

دەلالەی ئەو دوو ئایەتەی پێشەوە لەسەر حوکمی (المولی) دەلالەتێکی (ظني)یە و زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر حوکمی (المولی) و سێ ڕایان هەیە لەسەری:

ڕای یەکەم: وتەی الحنفية و الاباضية: بەڕای ئەمان دەبێ: ژنەکە چوار مانگ چاوەڕوان بکات ئەگەر مێردەکەی لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا گەڕایەوە بۆ لای و معاشرەی کرد ئەوا کارەکە ئاسایی دەبێ، بەڵام ئەگەر مێردەکەی نەگەڕایەوە بۆ لای دوای تێپەڕبوونی ئەو چوار مانگە ئەوا تەڵاقەکەی دەکەوێ (تلقائیا) بەبێ پێویستی حوکمی قەزائی.

ڕای دووەم: وتەی المالكية ـ الشافعية ـ الحنابلة: بەڕای ئەمان: ژنەکە دەعوایەك بەرز دەکاتەوە و قاضییش لەسەر بنەمای ئەو دەعوایە مێردەکە ناچار دەکات کە بگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکەی، بەڵام ئەگەر مێردەکە رەتی کردەوە، ئەو کاتە قازیی جیایان دەکاتەوە بە دەسەڵاتی خۆی بەبێ حسابکردن بۆ پیاوەکە.

ڕای سێیەم: وتەی جعفري ـ الظاهرية الزيدية: بەڕای ئەمان: قازیی زۆر لە مێردەکە دەکات کە معاشەرەی خێزانەکەی بکات یان تەڵاقی بدات، ئەگەر هیچیانی نەکرد حوکمی دەدات بە حەبس و دەیهێڵێتەوە لە زیندان هەتاوەکو پەشیمان دەبێتەوە یان خێزانەکەی تەڵاق دەدات، ئەگەر ئینکاریی کرد لەم دوانە ئەوا بە حەبسی دەیهێڵێتەوە لە سجن تا مردن.

نموونەی تر لە دەلالەتی ظني:

* لە سورەتی نساء ئایەتی (١٧٥) خودای گەورە دەفەرموێ: (... إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ...) (النساء : ١٧٦).

وشەی (ولد) ئیختیلافی تێدایە واتە دەلالەتی (ظني)یە، لەبەر ئەوە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە:

ڕای جمهور: ئەمان ڕایان وایە (ولد) بە مانای کوڕ دێ کەواتە کچ خوشك مەنع ناکات لە بەشبردن.

بەڵام بە ڕای جەعفەرییەکان: ئەمان ڕایان وایە (ولد) بە مانای کوڕیش و کچیش دێت، کەواتە کچیش بەهەمان شێوە خوشك (منع) دەکات لە میرات.

* یان نموونەیەکی تر (... فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ ...) (النساء : ١١).

لێرەدا وشەی (إخوة) ئیختلافی لەسەرە:

ـ جمهور: ئەمان ڕایان وایە کە (إخوة) لە دوو زیاتر واتە بەرەو سەرەوە ئەگرێتەوە لە خوشك و برا.

ـ شیعە (جعفری): بەڕای ئەمان یان دوو برا یان برایەك و دوو خوشك یان چوار خوشك دەگرێتەوە.

ـ إبن عباس: بەڕای ئەم (اخوة) سێ و بەرەو سەر ئەگرێتەوە واتە سێ زیاتر.

* هەروەها لە ئایەتی (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ) (البقرة : ٢٢٨) لفظي (قُرُوَءٍ) دەلالەتی (ظني)یە.

ـ حەنەفی و هاوڕێکانیان دەڵێت (قرء) واتە حیض.

ـ بەڵام شافعیەکان دەڵێن (قرء) واتە طهر.

**دووەم : سوننەتی نەبەوی**

(السنة) بە پلەی دووهەم دێ دوای قورئانی پیرۆز، ئیش پێکردنی واجبە بە دەلیلی قورئان و حەدیس و ئیجماع و عەقڵ مەگەر (حديث)ەکە ڕاست نەبێ.

لە ئایەتەکانی قورئاندا تەئکید دەکاتەوە لەسەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتنی.

خودای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ ...) (النساء : ٥٩)، لەم ئایەتەدا ئیشارەت دراوە بە چوار سەرچاوە لە شەریعەتدا.

اطيعوا الله ئاماژەیە بۆ الكتاب

اطيعوا الرسول ئاماژەیە بۆ السنة

اولى الامر ئاماژەیە بۆ الإجماع

فردوە ئاماژەیە بۆ القياس

(سنة) کە سەرچاوەی دووهەمە دوای قورئان و هەروەها حوجەیە لەسەر هەموو موسوڵمانان بە دەلیلی کیتاب و ئیجماع و عەقڵ.

* دليل الكتاب: ئەو ئایەتەی سەرەوە، هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا) (الحشر : ٧)، هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) (النجم : ٣-٤).

* دليل الإجماع: هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوە هەتاوەکو ئێستا، ئوممەتی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی کە (سنة) حوجەیە و نابێ موخالەفەی بکرێ و دەبێ کاری پێبکرێ.

* دليل العقل: عەقڵ و ژیریی وا ڕێنموییمان دەکەن کە قورئان پێویستە ئەو کەسە تەفسیری بکات و شەرحی بکات کە قورئان نێرراوە بۆی یان بۆی هاتۆتە خوارەوە کە ئەویش پێغەمبەرە ﷺ و دەبێ ئەو کەسە دەستپاك بێ لە گەیاندنی قورئاندا هەروەکو چۆن بۆی هاتۆتە خوارەوە کە ئەویش تەنها لە پێغەمبەردا بەدیی دەکرێ.

پێناسەی سنة: لغة: ڕێگایەکی ڕاهاتوو (معتاد)ە، جا ئەو ڕێگایە پەسەند بێ یان ناپەسەند وەك دەوترێ ڕێگای باووباپیران.

بەڵام پێناسەی فیقهیی: (السنة) ئەوەیە کارپێکردنی واجب نییە، بەڵام توشی پاداشت دەبێ، بێ سزادانی ئەوانەی کە تەرکی دەکەن، لەم پێناسەیەوە سوننەت پێناسەکەی هاوشێوەیە لەگەڵ پێناسەی (مندوب و مستحب و نافلة و تطوع).

پێناسەی (سنة) لە لای ئەهلی حدیث: گێڕانەوەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە وتەی (قول) یان کرداری (فعل) یان صفەتی یان سیرەتی یان هەڵوێستی.

پێناسەی (سنة) لای زانایانی (أصول): بریتییە لە وتەو کردار و تەقریرەکانی پێغەمبەر ﷺ.

وتەی پێغەمبەر: ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی وەکو (إنما الأعمال بالنيات..)

(فعل النبي) کردارەکانی پێغەمبەر ﷺ: وەکو شێوەی نوێژکردنی، پێغەمبەر دەفەرموێ: (صلوا كما رأيتموني اصلي..) نوێژ بکەن وەك چۆن نوێژ دەکەم.

پێناسەی تقریر: ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئینکاری نەکردووە بەڵکو ڕازیی بووە پێی و بە باشی زانیوە.

بۆ نموونە: پێغەمبەر ﷺ جارێکیان لە یەکێك لە غەزوەکاندا کە دەچن بۆ (بنو قريظة)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لا يصلين أحدكم إلا في بني قريظة) واتە نوێژ نەکەن تا نەگەینە بەنو قورەیزە..

لێرەدا هەندێ لە صەحابییەکان واتێگەیشتن کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەوەیە کە صەحابییەکان پەلە بکەن لە ڕۆیشتندا بۆ ئەوەی کە زوو بگەنە بەنو قورەیزە، بۆیە ئەمان لە ڕێگە نوێژیان کرد بۆ ئەوەی کە نوێژەکەیان نەفەوتێ، بەڵام هەندێکی تر لە صەحابەکان وا تێگەیشتن کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە نوێژ دوا بخرێ هەردەبێ لە بونو قورەیزە نوێژ بکرێ، ئەم دوو ڕەئە جیاوازە لای پێغەمبەر ﷺ باسکرا بێدەنگ بوو واتە بە هەردووکیان ڕازیی بوو، بەمە دەڵێن تقرير..

کەواتە سوننەتی پێغەمبەر دابەش دەکرێ بە سێ بەشەوە:

١) السنة القولية: وتەی پێغەمبەر ﷺ وەکو (انما الأعمال بالنيات و إنما لكل امرئ مانوى...) و ئەو ئەحکامانەی لە سوننەتی قەولییدا هاتووە زۆربەی ئەحکامی تەفصیلییە هەروەها هەندێ وتەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر شێوەی قەواعیدی شکلی وەکو (لاضرر و لاضرار).

٢) السنة الفعلية: ئەمەش کرداری پێغەمبەرە ﷺ وەکو کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا و ڕێزگرتنی میوان و ڕێزگرتنی لە (فقیر)، نموونەی پێشوو (صلوا كما رأيتموني اصلي) اخرجه امام أحمد في سنده ٣/٤٣٦.

٣) السنة التقريرية: وەك ئەوەی کە تەقریری پێغەمبەر ﷺ لەسەر (قضا)ی (دادوەریی) موعازی کوڕی جەبەل کاتێك کە ناردی بۆ یەمەن یان ئەو نموونەی پێشوو کە باسمان کرد. (لا يصلين احدكم إلا في بني قريظة) أخرجه أمام أحمد في باب الجهاد.

کەواتە جۆرەکانی سوننەت بە گوێرەی چۆنێتی دەرچوونی لە پێغەمبەرەوە ﷺ سێ جۆرە:

١ـ السنة القولية. ٢ـ السنة الفعلية. ٣ـ السنة التقريرية.

سوودی ئەم جۆرە دابەشکردنە بۆ (باب تعارض و ترجيح) لە نێوان دەلیلە شەرعییەکاندا هەروەکو زاناکان دەڵێن وتە (قول) بەهێزترە لە (فعل)، هەروەها (فعل)یش بەهێزترە لە (تقرير)، هەروەها...

**دابەشکردنی سوننەت بە گوێرەی سەنەدەکەی**

سوننەت بە گوێرەی سەنەدەکەی دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١) حديث متصل: اـ حديث متواتر. ب ـ حديث آحاد.

٢) حديث غير متصل (منقطع): اـ المرسل. ب ـ المعضل.

١) الحديث المتصل: بریتییە لەو فەرمودانەی کە سەنەدەکەی دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ بەبێ پچڕان.

٢) الحديث المنقطع: بریتییە لەو فەرمودانەی کە سەنەدەکەی پچڕانی تێ دەکەوێ تا دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ، جا ئەو بچڕانە لە سەرەتای زنجیرەی سەنەدەکە بێ یان لە ناوەڕاست یان لە کۆتایی.

حديث متصل:

لای جمهور دوو جۆرە:

١ـ حديث المتواتر (کۆمەڵێك). ٢ـ حديث الآحاد (یەك کەس).

لای حەنەفییەکان سێ جۆرە:

١ـ المتواتر (ژمارەیەکی زۆر). ٢ـ المشهور (چەند کەسێك). ٣ـ الآحاد (یەك کەس).

لای ئیمامی سیوطی چوار جۆرە:

١ـ المتواتر (ژمارەیەکی زۆر). ٢ـ المشهور (سێ کەس). ٣ـ العزیز (دوو کەس). ٤ـ الآحاد (یەك کەس).

زانستی سوننەت پێك دێ لە دوو بەشی سەرەکی:

١) بەشێکیان پەیوەستە بە سەنەدەوە و پێی دەوترێ زانستی گێڕانەوەی حدیث (روایة الحدیث ـ علوم الروایة). مەوزوعی (روایة) لێکۆڵینەوەیە لە (أحوال و صفات) و هەتاوەکو دەگاتە ئامانج واتە تەئکید کردنەوە لە نەپچڕانی سەنەدەکە بە پێغەمبەر ﷺ، واتە هەرکاتێك سەنەدەکە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ بە بێ پچڕان و بەو مەرجە گونجاوانەی کە دانراوە لە لایەن زاناکانەوە ئەو کاتە بەو سەنەدە دەوترێ (سند الصحیح).

٢) بەشەکەی تریان پەیوەندیی بە (متن)ەوەیە واتە بە دەقی فەرموودەکەوەیە و پێی دەوترێ زانستی (درایة). مەوزوعی (متن الحدیث) بریتییە لە زانینی دەقی فەرموودەکە و ئامانجەکانی و و مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە وتەکانی و فعلەکانی و تەقریرەکانی..

**الحدیث المتواتر:** بریتییە لە گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن کۆمەڵێکی زۆر لە صەحابییەکان بەمەرجێك (مستحل) بێ بەپێی عەقڵ و عادەت کە ئەم کۆمەڵە ڕێك بکەون لەسەر درۆ، پێویستە لەمانیشەوە کۆمەڵێکی زۆری تر فەرموودەکەیان گێڕابێتەوە و لەمانیشەوە کۆمەڵێکی تر تا دەگاتە سەردەمی نووسینەوەی حدیث (تدوین حدیث). واتە دەبێ هەموو (طبقة)کان ژمارەیان زۆربێ.

مەرجەکان: پێویستە ئەم مەرجانە لە فەرموودەی متواتردا هەبێ.

١) پێویستە جیلی یەکەم فەرموودەکەیان ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتبێ جا بە بینین بێ یان بە بیستن.

٢) پێویسته لای عەقڵ موستەحیل بێ کە ئەم کۆمەڵانە ڕێکەوتبن لەسەر درۆ.

٣) پێویستە مەرجی دووهەم دووبارە بێ لە هەموو (طبقة)کاندا کە دەیگێڕنەوە: (طبقه)کانیش

(صحابة ـ تابعين ـ تابعی تابعين)

صحابة: ئەو کەسانەن کە پێغەمبەریان ﷺ بینیوە و باوەڕیان پێبووە.

تابعين: ئەوکەسانەن کە (صحابة)یان بینیوە و باوەڕیان پێبووە.

تابعی تابعين: ئەو کەسانەن کە تابعینیان بینیوە و باوەڕیان پێبووە.

**جۆرەکانی حدیثی متواتر:**

١) المتواتر اللفظي: ئەو جۆرەیە کە یەك جۆر (لفظ)ی هەیە لە هەموو ڕێگاکانەوە، نموونە زۆرە لە فەرموودە فعلیەکاندا، بەڵام زۆر کەمە لە فەرموودە قەولیەکان، نموونە: (لاتكتبوا عني و من كتب عني شيئا غير القرآن فليمحه) یان (حدثوا عني و لاحرج) یان (ومن كذب علي متعمدا فليتبوا مقعده من النار)، ئەم فەرموودەیە زیاتر لە سەد (١٠٠) صەحابە گێڕاویانەتەوە.

٢) المتواتر المعنوي: ئەو جۆرە فەرمودانەیە کە ماناکانی گێڕاوەتەوە بە (الفاظ) و تەعابیری جیاواز، بەڵام هەموویان یەك مانایان هەیە، بۆ نموونە فەرموودەی (إنما الأعمال بالنيات..) ئەم فەرموودەیە گێڕاویانەتەوە بە چەندەها (الفاظ) و تەعابیری جیاواز، بەڵام هەموویان یەك مانایان هەیە..

**بایەخی الحديث المتواتر:**

فەرموودەی متواتر دەمانگەیەنێتە زانستێکی بێگومان و سەد لەسەد (علما قطعي) واتە (يقين)، پێویستە کاری پێبکرێت، چونکە (ثابت) بووە کە لە لایەن پێغەمبەری خوداوە وتراوە، هەروەها (قطعی ثبوته) وەکو قورئان.

فەرموودەی متەواتر دەلالەتەکەی (قطعي)یە ئەگەر هاتوو زیاتر لە یەك مانای هەڵنەگرت وە (ظني)یە ئەگەر هاتوو زیاتر لە یەك مانای هەڵگرت.

لە یەکەمیاندا (دەلالەتی قطعی): علماء دەفەرموون هەرکەسێك باوەڕ بەو فەرموودە متەواترەی کە دەلالەتی (قطعي) هەیە نەکات کافر دەبێ.

**حديث الآحاد (فەرموودەی آحاد) خەبەرێکی تاکە بە پێچەوانەی متواتر**

پێناسەکەی: بریتییە لەو فەرموودەیەی کە لە گێڕانەوەکەیدا لە هەموو تەبەقەیەکدا کەسێك یان دووان هەیە و سەنەدەکەی دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ و زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەم جۆرەیە، بە گوێرەی رەئی جمهور (حدیث)ی مەشهوریش دەکرێت بە فەرموودەی آحاد.

**ئەنجامەکانی ئەم پێناسەیە:**

١ـ فەرموودەی آحاد مەرجەکانی فەرموودەی متەواتری تێدا نییە.

٢ـ پێویستە سەنەدەکەی بگاتەوە پێغەمبەر ﷺ.

**حوکمەکەی:**

پێویستە کاری پێبکرێ لەبەر ئەوەی رەئی زۆرینە وایە، مەگەر دەلیلێکی تر هەبێ کە بەهێزتر بێ و پێچەوانەی ئەم بێ.

**بنەمای شەرعیی و ژیریی کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد.**

یەکەم: بنەمای شەرعیی:

أـ لە قورئانی پیرۆزدا: خودای گەورە دەفەرموێ: (یا ایها الذین آمنوا إن جاءکم فاسق بنبا فتبینوا..) ئەم ئایەتە ئاشکرایە مەفهومەکەی کە ئەوەیە ئەگەر کەسێك عادل بوو ئەوە خەبەرەکەی قبوڵ دەکرێ و هەروەها شایەتییەکەشی، پێویست بەوە ناکات کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێ، خودای گەورە دەفەرموێ: (فلولا نفر من کل فرقة منهم طائفة لیتفقهوا في الدین و لینذروا قومهم إذا رجعوا الیهم لعلهم یحذرون)، لەم ئایەتەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خودای گەورە هانی موسوڵمانان دەدات کە لە هەر کۆمەڵێکی زۆر چەند کەسێك شارەزابن لە دین و بۆ ئەوەی کە گەڕانەوە ئاگاداری هۆزەکانیان بکەن، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خەبەری ئاحاد حوجەیە، ئەگەر وانەبوایە خودای گەورە ئاوا ئاماژەی پێ نەدەکرد.

ب ـ لە سیرەی پێغەمبەران بە گشتیی: ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر گەلەکانیان لەسەر ئەساسی وەرگرتنی خەبەری تاك بووە، واتە بە تەنها نێراون و هیچ کەس ڕەخنەی نەگرتووە کە بڵێ مادەم پێغەمبەران بە تەنها نێراون ئەوا خەبەریان لێ وەرناگیرێ.

ج ـ له سیرەی پێغەمبەران: دەبینین کە پێغەمبەر ﷺ بەتاك صحابەی دەنارد بۆ هۆزو و تیرە جیاوازەکان، ئەگەر بهاتایە خەبەری تاك (حجة) نەبوایە ئەوا پێغەمبەر ﷺ نەیدەناردن.

دووهەم: بنەمای لۆجیکی:

لۆجیکی مرۆڤو بیری ساغ هەردووکیان دان دەنێن بە حجیەی خەبەری تاکدا و زەرورەتی وەرگرتن و ئیشپێکردنی، هەروەها گونجانی لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا، وەرگرتنی (حدیث آحاد) نە محاڵە و نە فەسادیش دروست دەکات لە کاتی وەرگرتنیدا.

خەبەری تاك بەڵگەیە بەم مەرجانەی کە زاناکان باسیان کردووە:

یەکەم: مەرجەکانی حەنەفیەکان بەم شێوەیەیە:

١ـ نابێ ئەو کەسەی کە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە کاری کردبێ.

٢ـ نابێ بابەتی خەبەرەکە لەو بابەتە هەمیشەییانەی ژیانی ڕۆژانە بێت.

٣ـ نابێ پێچەوانەی قاعیدەیەکی گشتیی یان پێوەرێکی ڕاست بێ.

٤ـ نابێ دژ بێ لەگەڵ بەڵگەیەك کە لە خۆی بەهێزتر بێ وەك (قورئان، سوننەتی متواتر و ئیجماع و قیاس).

* مەرجی یەکەم: ان لایعمل الراوي بخلاف مارواه:

نابێ راویی کار بکات بە پێچەوانەی ئەوەی کە گێڕابێتیەوە، چونکە ئیمام ئەبو حەنیفە ڕای وایە ئەگەر کەسێك (حدیث)ێك ڕیوایەت بکات خۆی لە پێشترە لە هەموو کەس کە کاری پێبکات، ئەگەر کاری پێنەکرد کەواتە (حدیث)ەکە دروست نییە، بۆیە ئیمام ئەبو حەنیفە رەدی ئەو (حدیث)ە دەکات کە لە دایکی موسوڵمانان عائیشەوە گێڕاوێتیەوە لە پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: (ایما امراة نکحت بغیر إذن ولیها فنکاحها باطل). هەر ئافرەتێك شوو بکات بەبێ ئیزنی وەلیەکەی، ئەوە نیکاحەکەی (باطل)ە.. حەنەفیەکان ئەم فەرموودەیە رەت دەکەنەوە چونکە دەڵێن دایکی موسوڵمانان عائیشە خۆی برازایەکی خۆی بەشوو دا بەبێ ئیزنی وەلیەکەی کە برای خۆی بوو، براکەی لەو کاتەدا لە شام بوو.

* مەرجی دووەم: ان لایکون موضوع خبر مما تعم البلوی:

نابێ مەوزوعەكە لەو حوكمانە بێت كە ڕۆژانە دووبارە دەبنەوە لە نێوان خەڵكییدا، بۆ نموونە كاتێك كە دەوترێ خوێندنەوەی فاتیحە لە نوێژدا واجبە (لاصلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب) ئەم فەرموودەیە یەك كەس گێڕاویەتیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە واجب بوو صەحابیەكی زۆر بیانگێڕایەتەوە، چونكە هەموو نوێژێك ژمارەیەكی زۆر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان كردووە، بەڵام كەسی تر لەو صەحابانە ئەم فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە بۆیە كاری پێناكرێت.

* مەرجی سێهەم: ان لايكون مخالفا للقاعدة الكلية:

چونكە لای ئیمام ئەبو حەنیفە قاعیدەی گشتیی لە پێش (خەبەری ئاحاد)ەوەیە وە لەبەرئەوەشە ئیمام ئەبو حەنیفە ڕەدی ئەو فەرموودەیە دەكات كە فاتمی كچی قەیس ڕیوایەتی كردووە دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ بڕاندوێتیەوە كە ئەگەر ئافرەتێك تەڵاق درا نەفەقە و سوكنای بۆ ناكرێ، بەڵام ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی قاعیدیەكی (گشتیی جێگیرە) كە دەڵێ ئەگەر ژنێك تەڵاق درا پێویستە نەفەقە و سوكنای بدرێتێ مادەم لە عیدەدایە، چونكە خودای گەورە دەفەرموێ: (أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم ...) (الطلاق : ٦).

* مەرجی چوارەم: ان لايعارض بدليل اقوى:

نابێ دژ بێ لەگەڵ بەڵگەیەك كە لە خۆی بەهێزتر بێ، چونكە هەریەك لە قورئانی پیرۆز و سوننەی متواتر و ئیجماع و قیاس بەهێزترن لە خەبەری آحاد.

لەبەرئەوەیە ڕەدی حدیثی (المصراة) دەداتەوە، چونكە بە نەزەری ئەو موخالیفە بە قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس.

فەرموودەكە: لاتصروا الابل و الغنم فمن ابتاعها بعد ذلك فهو بخير النظرين بعد ان يحلبها ان رضيها امسكها و ان سخطها ردها و صاعا من تمر.

گوانی وشتر و مەڕ مەبەستن، چونكە ئەگەر كەسێك بە گوان بەستراویی فرۆشتی ئەوا كەسی كڕیار كە شیرەكە بەكاردەهێنێ لە نێوان دوو ئیختیاردایە یان ڕازیی دەبێ و قبوڵی دەكات یان ڕەفزی دەكات و دەبێ حەیوانەكە بگەڕێنێتەوە لەگەڵ (صاعێك) لە خورما.

ئیمامی ئەبو حەنیفە كاری بەم فەرموودەیە نەكردووە چونكە:

١) پێچەوانەی قورئانە، خوای گەورە دەفەرموێ: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ...) (البقرة : ١٩٤)، هەرکەسێ دەستدرێژیی لێکردن ئەوا دەستدرێژیی لێ بکەنەوە بەقەدەر ئەو دەستدرێژییەی کە لێتان کراوە.

٢) پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو فەرموودە مەشهورەی کە دەفەرموێ (من اعتق شقصا له في عبد قوم عليه نصب شريكه إذا كان موسرا)، هەرکەسێ گەردنی بەندەیەك ئازاد بکات لە بەشەکەی خۆی لە پێشترە بە کڕینەوەی بەشی شەریکەکەی ئەگەر توانای هەبوو.

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو شیرە بەقەدر (صاعة) خورماکە چۆن دیاریی کرا کێ دەڵێ زیاتر نییە یان کەمتر.

هەروەها پێچەوانەی ئەو فەرموودە مەشهورەی کە دەفەرموێ (الخراج بالضمان)، بە گوێرەی ئەم قاعیدە ئەم شیرە موستەحەقی موشتەرییە، بۆی نییە کە هیچ بە موقابیلی ئەو شیرە بگەڕێنێتەوە.

٣) بە پێچەوانەوەی (إجماع)ە: چونکە إجماع دەڵێ ضمانی مثلی بە مثله و ضمانی قیمی بە قیمەتەکەیەتی.

واتە ئەگەر شتێك مثلی بوو پێویستە نموونەیەکی وەکو خۆی بۆ بهێنیتەوە و ئەگەر قیمی بوو ئەوا پێویستە قیمەتەکەی بۆ دابین بکات.

واتە ئەگەر هاتوو شیرە فەوتاوەکە مپلیات بوو پێویستە هەر شیری بۆ بگێڕیتەوە، بۆچی خورما ؟!.

ئەگەر هاتوو شیرە فەوتاوەکە قیمی بوو ئەوا پێویستە نرخی شیرەکە دیاریی بکرێ بە پارە و پارەی بۆ بگەڕێنیتەوە نەك خورما.

٤) بە پێچەوانەی قیاسە لەم ڕوانەوە:

<u>یەکەم:</u> القياس الكلي لە ضماندا هەرشتێ مثلی بوو ئەبێ ضمان بکرێ بە مثل وە ئەگەر قیمی بوو ضمان دەکرێ بە قیمەتەکەی.

<u>دووەم:</u> لە قیمەتدا نرخ زیادو کەم دەکات بە گوێرەی مقداری شتە لەناوچووەکە، چۆن دەبێ صاعی خورماکە بکرێ بە قیمەتی شیرە فەوتاوەکە.

سێهەم: ئەو شیرە فەوتاوە لەوانەیە هەندێکی لە کاتی بەستنی عەقدەکەدا دروست بووبێ و هەندێکی تریشی دوای بەستنی عەقدەکە، لەم کاتەدا هەندێکی ضمان ناکرێ، چونکە کێ هەیە ئەو شیرە لێك جیا بکاتەوە بۆ ئەو دوو کاتە جیاوازە.

چوارەم: شەرع دەفەرموێ گێڕانەوەی شتێك (واتە پەشیمان بوونەوە) دەبێ ئەو شتە عەیبێکی هەبێ یان مەرجێك هەبووبێ بۆ گەڕانەوەی، بەڵام ئەو خورمایە (نە عەیبە)ی هەبووە و (نە مەرج) تا بیگەڕێنێتەوە.

موناقەشەی ڕەئی حەنەفییەکان:

هەرچی ئەو بەڵگانەی کە حەنەفییەکان هێناویانە بۆ کارنەکردن بەم فەرموودەیە دامەزراوە لەسەر ئەساسێکی (موهوم).

ئەوان وا ئیعتیبار دەکەن ئەو (صاعة) خورمایە تەعویزە بۆ ئەو شیرەی کە فەوتاوە، بەڵام وا نییە، بەڵکو گەڕانەوەی ئەو (صاعة) خورمایە موقابیلی (معاملة بالحسنى) و بڵاوبوونەوەی ئەدەبە، خودای گەورە دەفەرموێ: (ادفع بالتي هي أحسن) و ئەم کردارە خۆی لە خۆیدا (فێڵ و هەڵخەڵەتاندنە) و هەر معامەلەیەك کە (فێڵ و هەڵخەڵەتاندن)ی تێدابوو کڕیار دەتوانێ عەقدەکە هەڵوەشێنێتەوە بەبێ ئەوەی کە ضمان بچێتە سەری هەروەکو چۆن قانونی مەدنیی عێراقیی وای وەرگرتووە کاتێك ئیسپاتی فێڵ کرا کڕیار بۆی هەیە فەسخی عەقد بکات بەبێ ئەوەی تەعویز بچێتە سەرشانی، هەروەها ئەو عەقدە مەوقوف دەبێ لەسەر ڕەزامەندیی موشتەری، بۆیە فەرموودەی (المصراة) خۆی لە خۆیدا ئەصلێکە لە ئوصوڵی شەریعە و جیاوازە لەگەڵ قاعیدەی تردا و ئەوەی لێرەدا باس کراوە جیاوازە لەگەڵ حدیث (الخراج بالضمان)، لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیە خۆی ئەصڵە و ئەصڵیش لە پێش قیاسەوەیە.

دووەم: مەرجەکانی مالکییەکان: بۆ کارکردن بە خەبەری ئاحاد و قبوڵکردنی.

١) نابێ خەبەری ئاحاد پێچەوانەی کاری ئەهلی مەدینە بێت (عمل أهل المدينة)، چونکە ئەهلی مەدینە:

أـ شارەزاترن لە سوننەت لە کەسانی تر.

ب ـ وەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە جیل بەدوای جیل بووە، بە شێوەیەك کە پچڕانی تێ نەکەوتووە، ئەهلی مەدینە کارکردنیان بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لە پێش خەڵکی ترەوە بووە.

ئەگەر هاتوو خەبەرێکی ئاحاد پێچەوانەی ئەهلی مەدینە بوو ئەوا ئەو فەرموودەیە لاوازە و عیللەت لەو فەرموودەیەدا دەبینرێ بەڕای مالیکییەکان، هەروەها بەڕای ئەوان ئەهلی مەدینە شارەزاترن لە کەسانی تر..

لەبەر ئەوەشە کە کار ناکەن بەو فەرموودەیەی کە ئیبن عومەر ڕیوایەتی کردووە لە بارەی (خیاری مجلس) دەڵێت ئەم فەرموودەیە موخالفە بە کاری ئەهلی مەدینە و فەرموودەکەش ئەمەیە: (المتبایعان بالخیار مالم یتفرقا الی ثلاثة أیام).

هەڵسەنگاندنی ڕای مالیکییەکان:

١ـ مەرج نییە زانستی (سوننە) کۆ بکرێتەوە تەنها لەو کەسانەدا کە لە مەدینەدا ژیاون، چونکە لە مێژووی ئیسلامدا دەبینرێ زۆرێك لە هاوەڵان لە دەرەوەی شاری مەدینە ژیاون و نەشگەڕاونەتەوە بۆ شاری مەدینە و هەریەك لەو صەحابانە بەشێك لەو زانستەی پێ بووە جا زۆر بێ یان کەم.

٢ـ بە نیسبەت (خیاری مجلس) کە دەڵێت ئیجماعی ئەهلی مەدینە وابووە کە کاری پێ نەکەن وانییە، چونکە ئەوەتا دەبینرێ لە کۆندا ئیبن عومەر کە ئەهلی مەدینەیە کاری پێ کردووە پاشانیش لە دوای ئەو (ئیبن ئەبی زئب)یش هەر کاری پێکردووە.

سێهەم: مەرجەکانی شافعییەکان و حەنبەلییەکان:

فوقەهاکانی شافعی و حەنبەلییەکان هیچ مەرجێکیان دانەنابوو بۆ کارکردن بە (حدیث آحاد) جگە لە ڕاستیی سەنەدەکەی و پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەگەر هاتوو سەنەدەکە صەحیح بوو و ئیتصاڵی هەبوو بە پێغەمبەر ﷺ ئەوا واجبە کاری پێ بکرێ.

چوارەم: مەرجەکانی ظاهرییەکان/ فوقەهاکانی ظاهرییەکان

هاوڕان لەگەڵ شافعییەکان و حەنابلییەکان بۆ کارکردن بە (خەبەری ئاحاد)، بەڵکو لەوانیش زیاتر دەڵێن کارکردن بە خەبەری ئاحاد واجبە، بەڵام شافعییەکان و حەنابلییەکان دەڵێن لە بابی ئیحتیات دایە، بەڵام ئەمان دەڵێن ئەگەر بەڵگەیەکی بەهێز نەبێ بەرامبەر بە (خەبەری ئاحاد)ەکە ئەوا کارپێکردنی واجبە.

پێنجەم: مەرجەکانی شیعەی ئیمامی:

یەکەم: شیعەکان پێچەوانەی جمهوری علماء پێناسەی (السنة)یان کردووە، چونکە لای جمهور پێناسەی (سنة) قەولی نەبیێ و فعل و تەقریری ئەوە)، بەڵام لای شیعە (السنة) بریتییە لە (قول المعصوم و فعله و تقريره) مەعصوم لای شیعە پێغەمبەر ﷺ و فاطمە و ئەئمەی اثنا عشرة.

دووەم: کارکردن بە خەبەری ئاحاد لای شیعە پێویستە ئەم دوو مەرجەی تێدا بێ.

١ـ پێویستە ئەو کەسانەی کە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە دەبێ دوان بن.

٢ـ نابێ پێچەوانە بێ لەگەڵ مەزهەبی ئەهل و بەیتدا (أهل البيت).

لەبەر ئەمەشە کار ناکەن بە زۆربەی فەرموودە ئاحادەکان و لەناویاندا ئەو فەرموودەی کە زەواجی موتعەی حەرام کردووە (الزواج المؤقت).

## ڕۆڵی سوننەت لە یاسای ئیسلامیدا

(السنة) لە شەریعەتی ئیسلامییدا بە سەرچاوەی دووەم دێ دوای قورئانی پیرۆز، پەیوەندیی (السنة) بە قورئانەوە وەکو پەیوەندیی ئەو یاسا و تەشریعاتانە وایە بە دەستوری وڵاتێکەوە.

ئاشکرایە کە دەستور لە وڵاتێکدا ناچێتە ناو جوزئیاتی ڕووداوە تایبەتییەکان بەڵکو باس لە هێڵە گشتییەکان دەکات (الخطوط العريضة) لە ژیانی سیاسیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتی و هەرشتێکی تر کە پەیوەندیی هەبێ بە کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە.

بەڵام (تەشریعات و یاسا و پرۆگرام و لەوائیح) دەچنە ناو وردەکاریی و دانەدانەی ئەو ڕووداوانەی کە پێویستیان بە تەفصیلات هەیە. بەو شێوەیە قورئان باس لە ئەساس و مەبادیئە گشتییەکان دەکات و (السنة) هەڵدەستێ بە ڕوونکردنەوە و ئاشکرا کردنی و مەبەستی و جێبەجێکردنی لە ژیانی ڕۆژانەدا، هەروەها (السنة) سەرچاوەکەی وەحییە، خودای گەورە دەفەرمویێ (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى...) (النجم : ٣ـ٤)، هەروەکو قورئانە بۆیە شانبەشانی قورئان دەڕوات بەبێ کاریگەریی کات و زەمان لەسەری، واتە بۆ هەموو سەردەم و شوێنێك گونجاوە.

لەبەر ئەوەشە ئوصولّییەکان هەندێ پەیوەندییان داناوە لە نێوان قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا و ئەو پەیوەندییانەش لەم خالّانەی خوارەوەدا دەبینرێ:

١ـ تخصيص عمومات القرآن. تایبەتکردنی دەقە گشتییەکانی قورئان.

٢ـ تقييد مطلقات القرآن. بەستنەوەی دەقە رەهاکانی قورئان.

٣ـ إيضاح مجملات القرآن. روونکردنەوەی دەقە تێکڕاکانی قورئان.

٤ـ تأكيد أحكام القرآن. جەختکردنەوەی یاساکانی قورئان.

٥ـ الإستقلال بوضع أحكام لاتوجد في القرآن صراحة.

سەربەخۆبوون لە دانانی یاساگەلێك کە بە راشکاویی لە قورئاندا نەهاتوون.

١) تخصيص عمومات القرآن:

هەندێ لە دەقەکانی قورئان دەقی گشتیین، بەلاّم (السنة) هاتووە مەبەستی مەشروعی روون کردۆتەوە کە ئەو گشتییە مەبەستی لە هەندێ تایبەتمەندییە، بۆ نموونە: خودای گەورە دەفەرموێ: (لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ ...) (النساء : ٧).

لەم ئایەتەدا بەدیی دەکرێ کە هەموو کەسێ (پیاو بێ یان ژن یان مندالّ) بۆیان هەیە میرات وەربگرن، بەلاّم (السنة) هاتووە تەخصیصی داناوە بۆ ئەم عمومە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (لايرث القاتل) (ليس للقاتل ميراث)، کەواتە دەردەکەوێ کە ئایەتەکە دەفەرموێ هەموو کەسێ میرات دەگرێ بەگشتیی، بەلاّم (السنة) هەندێ کەسی تیایدا جیاکردۆتەوە کە میرات ناگرێ ئەوانەش (قاتل)ن، قاتلّیش واتە ئەو کەسەی کە کەسێك دەکوژێ کە میراتی لێ وەردەگرێ.

نموونە لە قانوندا: هەرکەسێ ئەهلیەی کاملەی هەبێ حەقی تەصەروفی قانونیی هەیە لە مالّی خۆیدا، بەلاّم ماددەیەکی قانونیی تر هەیە هەندێ کەسی لێ ئیستثناء کردووە کە ئەوانەش ئەو کەسانەن کە (محجور عليه)ن، ئەمانە توانای تەصرفیان نییە.

٢) تقييد مطلقات القرآن:

دەبینرێ لە قورئاندا هەندێ ئەحکامی مطلق بەلاّم (السنة) هاتووە تەقییدی کردووە و مەبەستی لەو مطلقاتە، ڕوونکردۆتەوە بۆ نموونە:

خودای گەورە دەفەرموێ: (كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ)البقرة ١٨٠، لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ کەسێك دەتوانێ کە وەصیەت بکات هەموو ماڵەکەی ببەخشێ پاش مردنی واتە لەم ئایەتەدا باس لە کەم و زۆری ماڵەکە ناکات، بەڵام (سنة) هاتووە تەقیدی کردووە کە ئەویش دەبێ سێیەکی ماڵ (ثلث) ببەخشرێ هەروەك چۆن پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەربێت دەفەرموێ (الثلث و الثلث كثير).

نموونە لە قانوندا: (ضمان)ی ئازادیی گشتیی بەشێوەیەکی موتڵەقە، بەڵام لە ماددەیەکی تردا هاتووە دەڵێ ئەو (ضمان)ە گشتییە پێویستە موقەیەد بێ بە تێنەپەڕاندنی سنوری ئاداب و پەیڕەوی گشتیی.

## ٣ـ ایضاح مجملات القرآن:

هەندێ ئەحکام لە قورئاندا هاتووە بەشێوەیەکی تێکڕایی هاتوون، بۆ نموونە خودای گەورە فەرزکردنی نوێژ و زەکاتی بەگشتیی باس کردووە، واتە باسی وردەکاریی نەکردووە کە چەندی بکەن و چۆن بێ، بەڵام (سنة) هاتووە ئەو گشتییانەی ڕوون کردۆتەوە، بۆ نموونە لە نوێژدا باسی دەکات کە چەند نوێژ هەیە لە ڕۆژێکدا، هەروەها چەند رکاتە و چۆن دەکرێ.. هتد.

نموونە لە قانوندا: دەبینرێ زۆرێك لە مەسەلەی سیاسیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتی لە دەقە دەستورییەکاندا بەشێوەیەکی موجمەل هاتووە. وەك هەڵبژاردن (الإنتخابات) کە لە دەستوردا بەشێوەیەکی موجمەل هاتووە، بەڵام یاسا و تەشریعات دێن بە تەفصیل باسی لێ دەکەن.

## ٤ـ تأكيد بعض الأحكام القرآن:

(سنة) هەستاوە بە تەئکید کردنەوەی هەندێ ئەحکام کە پەیوەندیی هەیە بەتاك و کۆی کۆمەڵگاوە لە ژیانی ڕۆژانە، وەك ڕاستگۆیی، خو و ڕەوشتی جوان، فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە.. هتد.

بۆ نموونە: خودای گەورە دەفەرموێ (و بالوالدين احسانا..)، واتە لەگەڵ دایك و باوکتاندا باش بن.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دا تەئکید دەکاتەوە و دەفەرموێ (أمك أمك أمك ثم أباك)، واتە: سێ جار دەفەرموێ لەگەڵ دایکتان باشبن پاشان باوکتان.

نموونەی دووەم: خودای گەورە دەفەرموێ (وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ ...) (البقرة : ١٨٨)، واتە ماڵی یەکتر مەخۆن لە نێوانتاندا بە هەوانتە.

فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ تەئکید دەکاتەوە و دەفەرموێ (لايحل مال امرئ مسلم إلا بطيبة من نفسه)، واتە خواردنی ماڵی هەر موسڵمانێك حەرامە مەگەر بە رەزامەندیی خۆی نەبێ.

## ٥- الإستقلال بوضع أحكام لاتوجد في القرآن صراحة:

(سنة) سەربەخۆیی هەیە لە هەندێ حوکمدا کە ئەو حوکمە لە قورئاندا بە صەڕاحەت نەهاتووە.

نموونە: خودای گەورە دەفەرموێ کە حەرامە دوو خوشك بخوازی لەیەك کاتدا، بەڵام باسی ئەوەی نەکردووە کە لەیەك کاتدا حەرام بێ کە کچێك و پوری بخوازی، جا پوری کچەکە خوشکی باوکی بێ یان خوشکی دایکی، بەڵام سوننەت حەسمی دەکات و دەڵێ حەرامە..

نموونەیەکی تر لە میراتدا خودای گەورە باس لە (اصحاب الفروض) دەکات بۆ میرات، بەڵام باسی (عصبات) واتە پشت ناکات، بەڵام سوننەت باسی دەکات.

نموونە: لە باسی ئامرازەکانی ئیسپاتدا، خودای گەورە لە قورئاندا کە باسی شاهید دەکات تەنها باس لە شاهیدی پیاوێكو دوو ژن دەکات، بەڵام (سنة) دەفەرموێ بە شاهیدێكو سوێندێکیش حەقی ماڵی (ثابت) دەبێ.

ئەمانە هەمووی ئەوە دەگەیەنن کە (سنة) شوێنێکی گەورەی هەیە لە شەریعەتی ئیسلامدا و بۆیە هیچ کاتێك فوقەها و قازییەکان ناتوانن دەستبەرداری بن لەبەر گرنگی و مەکانەتی.

لەهەرە سەرچاوە گرنگەکانی سوننەت ئەمانەن:

* (صحاح الستة) کە (بخاری و مسلم و أبی داود، ترمذي و نسائي و إبن ماجة) دەگرێتەوە.

* موطأي إمام مالك.

* مستدرك حاكم.
* مسندی إمام احمدی کورِی حنبل.
* مصنف ی عبدالرزاق.
* سنن دارمی.
* سنن دار قطني.

**سێهەم: الإجماع (یەکدەنگی، کۆڕا):**

ئیجماع بە سێهەم سەرچاوەی تەشریع و بڕیاردان دەژمێردرێ لە ئیسلامدا، سەرەتاکەشی لەوکاتەوە دەستی پێکردووە کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، ئەوە بوو هاوەڵانی پێغەمبەر ڕووبەڕووی چەندین ڕووداوی نوێ دەبوونەوە، جا گەر لە قورئان و سوننەت بەدییان بکردایە ئەوا بڕیاریان لێوە دەدا، گەر لەو دوو سەرچاوەیەشەوە بەدییان نەکردایە لە ڕێی ڕاوێژ و پرس و ڕاوە بڕیاریان لێیەوە دەدا.

**پێناسەکەی:**

١ـ لە زمانەوانییدا: بریتییە لە یەکدەنگییەکی پێشوەخت و یەك هەڵوێستە لەسەر کارێ لە کارەکان.

في اللغة هو (العزم و الإتفاق)

اـ خوای گەورە دەفەرموێ: (فَأَجْمِعُواْ أَمْرَكُمْ) (یونس : ٧١) أي اعزموا عليه.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺدا: (لاصيام لمن لم يجمع الصيام من الليل أي لم يعزم و لم ينو في الليل الصيام).

ب ـ يقال اجمع القوم على كذا أي اتفقوا عليه.

٢) وفي إصطلاح أهل الشرع: لە زارەواشدا بریتییە لە (یەکدەنگی و ڕێککەوتنی موجتەهیدەکانی ئوممەت لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لەسەردەمێك لەسەردەمەکان، لەسەر بڕیار و حوکمێکی شەرعیی کە ڕێگەی ئیجتیهادی تێدا بێ لە ڕووداوێك لە ڕووداوەکان بە پشت بەستن بە سەنەدی شەرعیی لە قورئان و سوننەت).

لە پێناسەی ئیجماعەوە (استنتاج)ی چەند خاڵێك دەکەین:

ئەو خاڵانەی کە لە پێناسەی ئیجماعەوە هەڵی دەهێنجین بریتین لە:

١ـ یەکدەنگیی هەموو موجتەهیدەکان لەسەر بڕیارەکە پێویستە، بۆیە گەر هەندێ لە موجتەهیدەکان موخالەفە و پێچەوانەیان کرد، ئیجماع نایەتە دی.

٢ـ پێویستە موجتەهیدەکان لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بن.

٣ـ پێویستە ئیجماعی موجتەهیدەکان (صريح) ڕاشکاو یان (ضمنا) بێ.

٤ـ پێویستە (الإجماع) لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بێت، چونکە (الإجماع) لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەوری نییە.

٥ـ پێویستە بابەتی ئیجماعەکە لە (الأحکام الشرعیة الإجتهادیة) بێت و لە (أحکام قطعي ثابت) نەبێت.

٦ـ پێویستە ئیتفاقی موجتەهیدەکان پاڵپشت بێت بە سەنەدی شەرعیی لە قورئان و سوننەت (الکتاب و السنة).

هەندێ سەرنج و تێبینی:

١ـ ژمارەیەکی دیارییکراو دیاریی نەکراوە بۆ بەدیهاتنی ئیجماع. (بە کەمترین ژمارە (الإجماع) دێتە دی (بالإثنان) واتە بە دوان).

٢ـ مەرج نییە (أهل الإجماع) خەڵکی مەدینە بن یان لە هاوەڵان (صحابة) یان لە (آل بیت) بن.

٣ـ هەروەها مەرج نییە هەموویان یان زۆربەیان مردوو بن، هەروەها لە دوای ئیجماع گەڕانەوە نییە (لایجوز الرجوع بعد الإجماع).

## أنواع الإجماع (بەشەکانی ئیجماع)

| الإجماع بحسب وصفه | الإجماع بحسب معرفته | الإجماع بحسب طبیعته | الإجماع بحسب سنده |
|---|---|---|---|
| ١ـ صریح | ١ـ منقول | ١ـ الفعلي | ١ـ قائم علی أساس القرآن |
| ٢ـ ضمني | ٢ـ محصل | ٢ـ القولي | ٢ـ قائم علی أساس السنة |
| | | | ٣ـ قائم علی أساس القیاس |
| | | | ٤ـ قائم علی أساس المصلحة |

یەکەم / الإجماع بحسب وصفه (ئجماع بەپێی وەصفەکەی) اما صریح او ضمني:

ا) الإجماع الصریح (ئیجماعی ڕاشکاو): بریتییە لە یەکدەنگیی هەموو موجتەهیدەکان لەسەر حوکمێك لە ڕووداوێك کە دێتە بەردەمیان بە ڕاشکاویی.

واتە موجتەهیدەکان بە ڕاشکاویی بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن، هەریەکە لە موجتەهیدەکان شتێکی وایان لێ دەردەکەوێ کە بەڵگە بێ لەسەر بۆچوونەکەیان ئیتر قسە بێ یان بە کردەوە..

ئەم جۆرە (الإجماع)ە زۆر کەمە لە هەموو سەردەمەکانی ئیسلامییدا.

* نموونە لەسەر (الإجماع الصريح): ئیتیفاق کردن لەسەر کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی راشیدیندا.

ب - الإجماع الضمني (السكوتي): واتە هەندێ لە موجتەهیدەکان بڕیار لەسەر مەسەلەیەك بدەن، موجتەهیدەکانی تر بێ دەنگ بن.

بە مەرجێك (بێدەنگیی) موجتەهیدەکان بەڵگە بێت لەسەر رەزامەندیی و موافەقە نەك لەسەر (ئینکار و موخالفە).

دووەم: الإجماع بحسب معرفته أما إجماع محصل او منقول:

ا- الإجماع المحصل: هو الإجماع الحاصل بعد تتبع أقوال فقهاء. بریتییە لەو ئیجماعەی کە بەدیی دێت دوای شوێنکەوتنی وتەی فوقەها.

ب - الإجماع المنقول: هو الذي نقل الينا في أحد المراجع الفقهية المعتمدة.

ئەو ئیجماعەیە کە لە یەکێك لە مەراجیعە فقهییە باوەڕپێکراوەکانەوە پێمان گەیشتووە.

سێهەم: الإجماع بحسب طبيعته اما قولي او فعلي:

ا- الإجماع القولي: واتە موجتەهیدەکان بە قسە (قول) بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن.

ب - الإجماع الفعلي: بریتییە لە (عورفی عام) کە هەموو فوقەها لەسەری دەڕۆن.

تێبینی:

ئیجماعی فوقەها تا ڕادەیەك لە (السوابق القضائية) یان (عرف المحاكم) یان (سيرة القضاة في القانون) دەچێت.

بۆچوونی جیاواز هەیە لە نێوان یاساناسان سەبارەت بە (السوابق القضائية) کە ئایا.. سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسادانان یان نا؟

بەهەمان شێوە بۆچوونی جیاواز هەیە لە نێوان (الأصوليون) سەبارەت بە (الإجماع)..

ئایا سەرچاوەیەکی تەشریعیی سەربەخۆیە یان سەرچاوەیەکی تەشریعیی کاشفە.

چوارەم: الإجماع بحسب سنده:

١ـ قائم على أساس القرآن. ٢ـ قائم على أساس السنة. ٣ـ قائم على أساس القياس. ٤ـ قائم على أساس المصلحة.

١ـ الإجماع القائم على أساس القرآن:

ئیجماعی فوقەها لەسەر ئەوەی کە (کچی کوڕ) لە ئاستی (کچ)دایە لە کاتی نەبوونی (کوڕ) و (کچ)دایە.

هەروەها (کوڕی کوڕ) لە ئاستی (کوڕ)دایە لە کاتی نەبوونی (کوڕ) و (کچ) بەپشت بەستن بە وتەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ) (النساء : ١١)، چونکە وشەی (الولد) شمولی (بنت إبن و إبن إبن) دەکات.

٢ـ الإجماع القائم على أساس السنة: ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەی (اختلاف الدين) جیاوازیی ئایین ڕێگرە لە (الارث) میرات گرتن بەپشت بەستن بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (لايتوارث أهل ملتين)

٣ـ الإجماع القائم على أساس القياس: ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر (قتال مانعي الزكاة) شەڕکردن و کوشتنی ئەو کەسانەی کە زەکات نادەن بە قیاسکردن لەسەر (تارك الصلاة) چونکە ئەوانەی کە (تارك الصلاة)ن دەکوژرێن، خوای گەورە دەفەرموێ: (وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ) (البقرة : ٤٣)، زەکات و نوێژ هەردووکیان دوو پایەن لە پایەکانی ئیسلام، بۆیە ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا (الردة) فەرمووی: (والله لاأفرق بين ماجمع الله) أخرجه مسلم في كتاب الإيمان.

واتە: سوێند بێت بە خودا جیاوازیی ناکەم لە نێوان نوێژ و زەکاتدا.

٤ـ الإجماع القائم على اساس المصلحة:

ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر (قتل الجماعة بواحد)، واتە ئەگەر چەند کەسێك هەستان بە کوشتنی (کەسێك) پێویستە هەموویان بکوژرێنەوە.

بەرژەوەندیی لێرەدا (پاراستنی گیانی خەڵکانە لە تاوانباران و لادەران).

**حكم الإجماع:**

١- ئەگەر ئیجماع ڕاشکاو (صریح) یان ڕوون بوو پێویستە کاری پێبکرێ و نابێ (مخالفة) پێچەوانەی کاربکرێ، ئەگەر سەنەدەکەی دەلیلێکی قەتعیی بوو لە قورئان و سوننەت ئەوا موخالەفەکردنی کوفرە و دەرچوونە لە دین.

٢- ئەگەر سەنەدەکەی بەڵگەیەکی (ظني) بوو موخالەفەکردنی (فسق و بدعة)یە.

٣- ئەگەر ئیجماع (ضمني) بوو، ئەوا (حوججەیە)، بەڵام لەم جۆرەیاندا جیاوازیی هەیە لە نێوان فوقەها و ئصولییندا، بۆیە جمهور لەسەر ئەوەن کە حوججەیە و پێویستە کاری پێبکرێت. بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن حوججە نییە.

**ئایا ئیجماع ڕوو دەدات؟**

هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە ڕوودانی ئیجماع شتێکی (غیر ممکن)ە، بەڵام بە بەرامبەر ئەمانە کۆمەڵێکی تر لە زانایان دەڵێن ڕوودانی ئیجماع (غیر ممکن) نییە.

١- ئیجماع لە هەندێ بابەت لە نێوان موجتەهدیندا (ممکن)ە، دەکرێ ڕوو بدات.. بەڵام لە بابەتی تازەو نوێ (غیر ممکن)ەو ڕوو نادات.

٢- ئیجماع لە ناو مەزهەبێك یان خوێندنگەیەکی یاسایی (مدرسة قانونیة) یان (فقهی) دەکرێ ڕوو بدات.. بەڵام لەسەر ئاستی هەموو مەزهەبەکان (ممکن) نییە.

٣- ئیجماع لە ناوچەیەکی دیارییکراودا (ممکن)ە، ڕوو ئەدات، بەڵام لە چەند ناوچەی جیاوازدا (بلاد عدیدة) مومکین نییە ڕوو بدات.

٤- ئیجماع لەم بارودۆخە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتییەی کە تیایدا دەژین مومکین نییە ڕوو بدات.

بەڵام لە بارودۆخی میسالی و نموونەیی کە لێکتێگەیشتن شوێنی (شقاق و نفاق) بگرێتەوە ئەوا ئیجماع مومکینە.

**هەڵوەشاندنەوەی ئیجماع بە ئیجماعێکی تر**

زۆربەی زانایان دەڵێن ناکرێ ئیجماع (الغاء) هەڵبوەشێنرێتەوە بە ئیجماعێکی تر. چونکە ئیجماعی پێشوو (الإجماع سابق) نابێ موخالەفە بکرێ و هەڵبوەشێتەوە، بەڵام زانایانی تر دەڵێن:

١ـ ئیجماع ئەگەر سەنەدەکەی (قطعی) بوو نابێ (الغاء) بکرێتەوە بە هیچ شێوەیەك.

٢ـ ئیجماع ئەگەر سەنەدەکەی (مصلحة مؤقتة) بەرژەوەندییەکی کاتیی بوو بە (کات و شوێن) (زمان و مکان) دەکرێ (الغاء) بکرێتەوە، هەرکاتێ ئەو بەرژەوەندییە نەماو کۆتایی هات.

چونکە بەرژەوەندیی (مصلحة) لەگەڵ (العلة)دایە، حوکم لەگەڵ (علة)دایە بە بوون و نەبوون (الحکم دائر مدار العلة وجودا و عدما). عیللە هەبوو حوکم هەیە، ئەگەر نەبوو حوکم نییە.

**چوارەم: بەراورد (القياس)**

**پێناسەکەی:**

قياس لە (زمان)دا في اللغة: هو التقدير و التسوية: بريتييە لە ئەندازەدانان و تەقديركردن.

لە زاراوەشدا (في إصطلاح) بەيەكگەياندنی ئەو حاڵەتەی كە دەقی لەسەر نييە بە حاڵەتێك كە دەقی لەسەر هاتووە لە حوكمدا بە بەڵگەی ئەوەی كە هاوبەشن لە (عللەتدا).

الحاق المسكوت عنه بمنصوص عليه في حكمه بدليل إشتراكهما في العلة.

دەتوانين ئەم پێناسەيەش بكەين: (بريتييە لەو يەكسانييەی لە نێوان فەرع و ئەصڵ دا لە عيللەتی وەرگيراو لە حوكمی ئەصڵەكە).

**پايەكانی:**

پايەو ڕوكنەكانی قياس چوارن:

١) المقيس عليه (الأصل): واتە ئەوەی كە قياسەكەی دەكرێتە سەر.

٢) المقيس (الفرع): واتە قياسكراوەكە، ئەو حاڵەتەيە كە ئەمانەوێت قياسی بكەين لەسەر ئەصڵدا.

٣) حكم الأصل: حوكمی ئەصڵ واتە ئايا واجبە، يا تەحريمە، يا ئيباحەيە، يا كەراهەتە، يا نەدبە.

٤ـ العلة (عيللەت): بريتييە لەو وەسفە هاوبەشەی كە لە نێوان فەرع و ئەصڵەكەدايە و كۆيان دەكاتەوە، بە هۆی ئەوەوە قياسەكە كراوە.

طرق معرفة العلة: ١ـ بالنص و الإجماع. ٢ـ الإجتهاد.

انواعه (جۆرەكانی): قياس چەند جۆرێكی هەيە.

**جۆرەكانی:**

١ـ بحسب الوضوح: أـ القياس الجلي. ب ـ القياس الخفي.

٢ـ بحسب وجود العلة في الفرع. أـ قياس الأولى. ب ـ قياس المساواة. ج ـ قياس الأدنى.

٣ـ بحسب التوصل الى العلة. أـ قياس منصوص العلة. ب ـ قياس مستنبط العلة.

<u>١) القياس بحسب الوضوح:</u>

ا- القياس الجلي: برتييه لەو قیاسەی کە موجتەهید دڵنیایە لە عیللەتی حوکم بە یەقینی و دڵنیایی.

ب - القياس الخفي: بریتییە لەو قیاسەی کە موجتەهید بەگومانە (یظن) لە عیللەتی.

<u>٢) القياس بحسب وجود العلة في الفرع:</u>

ا- قیاس الأولی: عیللەت لە فەرعدا بەهێزترە لە عیللەت لە ئەصڵدا، بۆ نموونە (قیاس) (الضرب على التأفيف) (قیاسی لێدان لەسەر ئۆف کردن). خوای گەورە دەفەرموێ: (فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا) (الإسراء : ٢٣).

ب - قیاس المساواة: عیللەت لە فەرعدا یەکسانە بە عیللەت لە ئەصڵدا.

* نموونە: قیاسی سووتاندنی ماڵی هەتیو و لەسەر خواردنی. چونکە (الإحراق) سووتاندنیش وەکو خواردن لەناوبردنە. خوای گەورە نەهی کردووە لە خواردنی ماڵی هەتیو بە ناحەق.

ج - قیاس الأدنی: عیللەت لە فەرعدا لاوازترە لە عیللەت لە ئەصڵدا.

قیاس سێو (تفاح) لەسەر گەنم (البر) لە حەرامێتی ڕیبادا (سوو)، چونکە هەردووکیان خواردنن.

**مەرجەکانی قیاس**

بۆ ئەوەی قیاس ڕاست و دروست بێت پێویستە لە هەریەکە لە (الحكم - العلة)دا مەرجی پێویست هەبن کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕوونی دەکەینەوە..

یەکەم: شروط الحكم: مەرجەکانی حوکم: زانایانی (ئوصولّ) چەند مەرجێکیان داناوە بۆ (حکم) بۆ ئەوەی قیاس ڕاست و دروست بێ کە لە حەوت خاڵدا کورتی دەکەینەوە.

١- پێویستە حوکمەکە حوکمێکی شەرعیی بێت (لغوي و عقلي) نەبێت. حوکمی شەرعیی وەکو (حەڵاڵ - حەرام - ندب - کراهة - الصحة - البطلان - فساد - طهارة - نجاسة - سببية - شرطية - مانعية) قیاس ناکرێ لەسەر حوکمی (اللغوي - عەقڵی) (الوجوب - الإستحالة - الإمكان).

٢- پێویستە حوکمی ئەصڵیی عیللەتەکەی عەقڵ هەستی پێ بکات، چونکە قیاس دێتە دی ئەگەر حوکمێك عیللەتەکەی بزانرێ. عیللەتیش ڕووی لەیەك چوونە لە نێوان ئەصڵ و فەرعدا.

٣ـ ئەبێت حوکمەکە مەنسوخ نەبێ، چونکە مەنسوخ کارکردن پێی باتڵە، هەرشتێکیش لەسەر باتڵ بنیاد بنرێ باتڵە.

٤ـ نابێت حوکمی ئەصڵ لە دوای فەرع هاتبێ، چونکە قیاسی بابەتی قانونی پێشوو (قانون السابق) ناکرێ لەسەر بابەتی (قانون لاحق). بۆ نموونە: (قیاسی دەستنوێژ ناکرێ لەسەر تەیەموم) بێ.

٥ـ پێویستە (حوکمی ئەصڵ) ثابت بووبێ بە (نص + الإجماع) بەدەق یان بە ئیجماع.

دروست نییە قیاس بکرێ لەسەر حوکمێك ئەگەر ثابت نەبووبێ بەو دوو سەرچاوەیە، چونکە قیاسکردن لەسەر ئەصڵی یەکەم لە پێشترە (القیاس علی الأصل الأول اولی بالإعتبار).

٦ـ نابێت (حوکمی ئەصڵ) حوکمێکی نائاسایی (استثنائي) بێت. لە ڕێسا و بنەمای گشتیی بۆ ئەوەی بەهاو سوودی (إستثناء) بمێنێ.

(واتە: نابێت ئەصڵ ببێت بە إستثناء، إستثنائیش ببێت بە ئەصڵ)

بۆ نموونە: هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ: (خزيمة کوڕی ثابت) شایەتیدانی بە دوو شاهیدی دەچوو، کە ئەمەش إستثناء لە بنەمای شەهادە، لە دوای ئەم حاڵەتەوە نەبینراوە ڕۆژێ لە ڕۆژان قازییەکی ئیسلام قیاسی کەسێکی تر بکات لەسەر (خوزیمەی کوڕی سابت). چونکە حوکمی (خزيمة) إستثناء بووە لەسەر ڕێساو بنەمای گشتیی شەهادە. بنەمای گشتیی شاهیدیی دەبێ دوو کەس بن یان هەرشتێکی تر لە حوکمی ئەو دوو کەسەدا بێ.

٧) نابێت بەڵگەی ئەصڵەکە بە عیبارەتێکی ئاشکرا (فرع)ەکە بگرێتەوە.

* بۆ نموونە: قیاسی هەموو سەرخۆشکەرەکان ناکرێ لەسەر (خمر)، چونکە دەقی حەرام کردنی

(خمر)، دەقێکە لەسەر حەرام کردنی هەموو سەرخۆشکەرێك و موخەدرێك.

**دووەم: شروط العلة (مەرجەکانی عیللەت):**

لە زمانەوانییدا (في اللغة) بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی گۆڕان لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر.

نموونە: نەخۆشی (عیللە)یە، چونکە نەخۆش باری تەندروستیی دەگۆڕێ.

و في الإصطلاح الشرعي: هي الوصف المنضبط المعرف للحكم و الموجب له و الباعث عليه.

زانایانی بواری ئوصولّ بۆ ڕاستیی قیاس، قیاسیان بەستۆتەوە بە بوونی چەند مەرجێك لە عیللەدا چونکە عیللەت میحوەری قیاس و ئەرکانی قیاسە.

**مەرجەکانی (عیللە):**

١ـ ئەبێت (عیللە) هەبێت ـ لە ئەصلّ و فەرعدا. بەپێی گومانی زۆربەی موجتەهیدان.

٢ـ نابێت (عیللە) الغاء بووبێتەوە لە فەرعدا بەدەقی ئاشکرا و ڕوون.

بۆ نموونە قیاسی (بنت) ناکرێ لەسەر (إبن) وە قیاس (الاخت) ناکرێ لەسەر (أخ) بە هۆی یەکسانییان و نزیکییان (قرابة) بەهەمان دەرەجە (القرابة بنفس الدرجة)، چونکە لە قورئاندا دەفەرموێ (للذكر مثل حظ الأنثيين) لە هەردوو ئایەتی (الأولاد) و (الأخوة)[1]دا، کەواتە دەقی قورئان (الغاء)ی (عیللە)ی کردووە.

٣ـ نابێت بۆ عیللە (مانع) ڕێگر هەبێ کە ڕێگریی بکات لەسەر (حكم المقيس) (القاتل يجب القصاص منه)، بکوژ پێویستە بکوژرێتەوە، بەڵام (باوك) کوڕی خۆی بکوژێ ناکوژرێتەوە. چونکە (باوکایەتی) ڕێگرە لە (قصاص) لای جمهوری فوقەها.

**قۆناغەکانی قیاس**

قیاس بە چوار قۆناغدا تێدەپەڕێ.

١ـ تخريج المناط.

٢ـ تحقيق المناط.

٣ـ تنقيح المناط.

٤ـ تثبيت المناط.

المناط واتە ئەوەی حوکمەکەی پێوە بەستراوە، واتە عیللە. حوکم بە بوون و نەبوون لەگەڵ عیللەدایە، ئەگەر (علة) هەبوو حوکم هەیە، ئەگەر (علة) نەبوو حوکم نییە.

---

[1] واتە لە ئایەتی (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ) (النساء : ١١) و ئایەتی (وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ) (النساء : ١٧٦)

١) تخريج المناط: بريتييه له زانينى (علة)ى حوكم، واته بريتييه له دەرهێنانى (علة). موجتەهيد هەوڵ ئەدات بۆ زانينى ئەو (علة)يە كە پاڵنەرە بۆ حوكم ئەمەش بە گەڕانەوەى بۆ (نص + الإجماع + إجتهاد)، زانايانى ئوصولٚ ڕێگاكانى دۆزينەوەى عيللەيان ناوناوە (مسالك العلة) و وردەكاريى زۆريشيان تيا كردووە. كە لە كتێبە گەورەكاندا بە دوور و درێژيى باس كراون.

٢) تحقيق المناط: بريتييه له تەئكيد كردنەوەى لەسەر بوونى (علة) له فەرعدا.

٣) تنقيح المناط: ئەگەر له نێوان (الأصل) و (الفرع)دا فەرق و جياوازيى هەبوو پێويستە ئەو جياوازييانە دوور بخرێنەوەو كاريگەرييان لەسەر (حوكم)ى هاوبەشى نێوان ئەصڵ و فەرعدا نەبێت.

* نموونە: قياسى پارەى كاغەز و ئاسن لەسەر ئاڵتون و زيو، له ئەحكامى (زكاة)دا. لەگەڵ ئەوەشدا جياوازيى هەيە لە نێوانياندا، قيمەتى ئاڵتون و زيو بەهايەكى زاتييە، بەڵام بەهاى (قيمة) (العملات الورقة و المعدنية) بەهايەكى ئيعتبارييە. بەپێى بەهێزيى ئەو وڵاتە لە ڕووى ئابوورى و جێگرى سياسييەوە.

٤) تثبيت المناط: ئەگەر پاش ئەو سێ قۆناغەى ڕابردوو بۆمان دەركەوت كە (علة)ى حوكمى (ئەصڵ) لە (فەرع)دا نييە ئەوا (حوكمى ئەصڵ) نادەين بەسەر فەرعدا.

واتە: حوكم لەگەڵ (علة)دايە. ئەگەر (علة) هەبوو حوكم هەيە، ئەگەر (علة) نەبوو حوكم نييە.

**بوارەكانى قياس**

بێگومان هەموو حوكمێك ناگونجێ ئيجتهادى تيا بكرێ، واتە هەموو حوكمێك قابيلى قياس نييە.

حوكمى شەرعى دوو جۆرە:

١ـ الأحكام التي لامجال للقياس فيها. (ئەو ئەحكامانەى كە ڕێگا نادرێ قياسى تێدا بكرێت)

٢ـ الأحكام التي يجوز للقياس فيها. (ئەو ئەحكامانەى كە ڕێگا دەدرێ قياسى تێدا بكرێت)

**یەکەم: ئەوەی کە قیاسی تێدا ناکرێت**

١ـ لایجری القیاس في الجنایات: قیاس لە جنایاتدا ناکرێ، چونکە شەریعەی ئیسلامیی یەکەم شەریعەیە کە کاری بە بنەمای (لاجریمة و لاعقوبة إلا بنص) کردووە، ئەم بنەمایە لەم ئایەتە وەرگیراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً) (الإسراء : ١٥)، کەواتە قازیی دەسەڵاتی داهێنانی جەریمە و عقوبەی نییە، قازیی لە جنایاتدا پابەندە بە (نص) و ناتوانێ قیاس بکات.

٢ـ لایجوز القیاس في العیبادات: زیفەی عیبادات ڕێکخستن و بەهێز کردنی پەیوەندیی بەندەکانە بە خوداوە (الله)، تەنها خوای گەورە دەسەڵاتی دانانی (عیباداتی) هەیە.

٣ـ لایجوز القیاس في الأمور الإعتیادیة و الخلقیة: قیاس ناکرێ لەو کارانەی پەیوەندیی بە عادات و تەقالید و ڕەوشتی خەڵکەوە هەیە وەکو (سن الیاس) (مدة الحمل).

٤ـ لایجری القیاس في الأحكام التعبدیة: قیاس لە ئەحکامی پەرستش ناکرێ.. ئەو کارانەی کە بە تەواوی ئامانجەکەی هەست پێ ناکرێ. ناتوانرێ (مانگی ڕەمەزان) ڕۆژی ڕەمەزان ببرێتە مانگێکی تر، چونکە ڕۆژووی ڕەمەزان کارێکی (تعبدي)یە.

**دووەم: لەم بوارانەی خوارەوە دەکرێ قیاس بکرێت.**

(باری کەسێتی ـ مامەڵەی دانوستان ـ یاسای نێودەوڵەتی ـ یاسای دەستووری). هەندێ لە فوقەها ئەم بوارانە ناو دەبەن بە (منطقة الفراغ التشریعي). ئێستاش باس لە هەریەکێکیان دەکەین بە نموونەوە:

ا) باری کەسێتی:

نموونەی یەکەم: هەرکاتێك وەسێتبۆکراو وەسێتکەر بکوژێت بێبەش دەبێت لە وەسێتەکەی، ئەمیش بە قیاس لەسەر بێبەشبوونی میراتوەرگر، هەرکاتێك میراتلێوەرگیراو بکوژێ.

لێرەدا عیللەی هاوبەش هەیە کە ئەویش پاراستنی گیانی بێتاوانانە (العلة المشتركة هي حماية أرواح الأبرياء)، لەم حاڵەتەدا قاعیدەی شەرعیی جێبەجێ دەکرێ: (من إستعجل الشئ قبل آوانه عوقب بحرمانه).

نموونەی دووەم: قیاسی مەرگ لەسەر تەڵاق.

کەسێك ژنی هێنا، بەڵام پێش گواستنەوەی مرد و مارەیی ژنەکەش دیاریی نەکرابوو، قیاس دەکرێ لەسەر تەڵاقدانی ژنێك دوای گوێزانەوە، کە ئەمیش مارەیی بۆ دیاریی نەکراوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا (مهر المثل) دیاریی دەکرێت.

عیللە: بریتییە لە پاراستنی بەرژەوەندیی ژنەکە (زوجة) بە پێدانی (تعویض) لە ئەنجامی ئەو زەرەرە مەعنەوییەی لێی کەوتووە. ئەم قیاسە (إبن مسعود) ئیستنادی لەسەر کردووە.

بەڵام (ئیمامی عەلی) قیاسی (الموت)ی کردووە لەسەر (طلاق قبل الدخول)، (مهر المثل) لە ئەساسدا خۆی کارێکی (قیاس)و بەراوردکارییە.

ب ـ مامەڵەی دانوستان:

١ـ نموونە: قیاس کردنی (غیر البیع من المعاملات المالیة) لە کەراهەت و حرمة ـ بطلان ـ فساد ـ حجة. لە کاتی بانگکردن بۆ نوێژی هەینی (صلاة الجمعة). لە کاتی نوێژی هەینییدا (بیع) حەرامە، قیاسی (غیر البیع) کراوە لەسەر (بیع).

(عیللە) ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی ئاینی و زاڵکردنیەتی بەسەر بەرژەوەندیی تایبەتی و ماددییدا.

٢ـ نموونە: قیاس (الوکالة العامة علی الوکالة الخاصة):

(الوکالة خاصة) جێگیر بووە بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، قیاس (الوکالة العامة) کراوە لەسەر (الوکالة خاصة). بە هۆی پێویستی بە (نیابة عن الغیر) لە تەعریفاتی شەرعی و قانونییدا. چونکە (موکل) ناتوانێ مومارەسەی هەڵسوکەوتەکە بکات بە خودی خۆی بە هۆی (نەخۆشیی ـ پیریی ـ مەشغوڵی ـ نەشارەزایی.. هتد).

ج ـ یاسای نێودەوڵەتی:

وەکو قیاسکردنی ڕێکەوتنامەی دوەلی (ثنائی و جماعی) لەسەر (صلح الحدیبیة) و قیاسکردنی مومارەسە کردنی سیاسەتی نێودەوڵەتی لەسەر ژیانی پێغەمبەر ﷺ (سیرة) لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ پاشاو دەسەڵاتداران لە سەردەمی خۆیدا. سیاسەتی (الحرب ـ السلم) بەپێی بارودۆخ.

دـ یاسای دەستووریی:

لە بابەتی دەستورییدا دەتوانرێ قیاسی بابەتی نوێ و تازە بکرێ لەسەر عەمەلی پێغەمبەر ﷺ (سیرة) و خەلیفەکانی.

(عیلله) بریتییه له ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی باڵای میللەت.

**حوجیەتی قیاس**

قیاس حوجەیەکی شەرعییە پێویستە کاری پێ بکرێت لە کاتی نەبوونی دەقێکی شەرعیی یان ئیجماعێکی (قطعي)دا بە پشت بەستن بە کیتاب یان سوننە یان ئیجماع یان عەقڵی سەلیم بۆ نموونە:

ـ دەلیلی کیتاب لەسەر حوجیەتی قیاس:

لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆر هەیە کە دەلیلن لەسەر حوجیەتی قیاس بە عیبارەت یان بە ئیشارەت لێی، نموونە خوای گەورە دەفەرموێت: (فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ) (الحشر : ٢ )، ڕووی دەلالەتی ئەم ئایەتە، خوا فەرمانی کردووە بە عیبرەت وەرگرتن لە قەومەکانی پێشتر، هەر بۆیە هەر قەومێك سیفەتەکانی لە سیفەتەکانی ئەوان بچێت ئەوا مەصیریان وەکو مەصیری ئەو قەومانە دەبێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا حوکمدانە بەسەر شتێکدا لە بەرامبەر شتێکی تر، ئەمەش (قیاس)ە.

هەروەها ئایەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ) (النساء : ٥٩)، وەجهی دەلالەتی ئایەتەکە، خوا ئەمری کردووە بە موسوڵمانان کە لە مەسەلە خیلافیەکاندا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش قیاسە.

ـ دەلیلی سوننە لەسەر حوجیەتی قیاس:

نموونە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە (موعازی کوڕی جەبەل)ی نارد بۆ یەمەن ببێت بە قازیی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی موعاز لە یەمەن بە چی حوکم دەکەی، موعاز فەرمووی: بە کیتابی خوا، ئەگەر لەودا نەبوو ئەوا بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر لەویشدا نەبوو ئەوا قیاسی کارێك دەکەم بە کارێکی تر...)، پێغەمبەر ﷺ ڕەئەکەی پەسەند کرد.

فەرموودەکەش ئەمەیە: (قال ﷺبم تحكمان؟ قال بكتاب الله، فإن لم نجد في كتاب الله، حكمنا بسنة رسول الله، فإن لم نجد الحكم في كتاب الله و السنة نقيس الأمر بالأمر فما كان الأمر للحق نعمل به) رواه أحمد و حسنه الجمهور.

ـ دەلیلی ئیجماع لەسەر حوجیەتی قیاس:

ئیجماعی فوقەهای صەحابە ئیجماعێکی سکوتیان هەیە لەسەر حوجیەتی قیاس و هیچ کام لە هاوەڵان (صحابة) ئینکاریی ئەم قیاسەیان نەکردووە.

ـ دەلیلی عەقلی سەلیم لەسەر حوجیەتی قیاس:

عەقڵی سەلیمیش ڕێگامان نیشان دەدات بە پێویستیی کارکردن بە قیاس، ئەمەش لە کاتێکدا ئەگەر سەبارەت بەو مەسەلەیە هیچ دەقێکی شەرعیی نەبوو، ئەمەش بە دەلیلی ئەوەی کە دەقەکان موتەناهین، بەڵام فەرمودەکان ناموتەناهین (ناکۆتایین).

**گرنگیی قیاس:**

گرنگییەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆ دەبنەوە:

١) قیاس وەسیلەیەکە لە وەسائیلەکانی تەفسیری دەقەکان و فراوانکردنی مەودایان.

٢) قیاس هۆیەکە بۆ کۆکردنەوەی لێکچووەکان و هاوبەرامبەرەکان لە ژێر قاعیدەیەکی شەرعییدا (الإشباه و النظائر).

٣) قیاس ئیستدلال کردنە بە عیللەتی حوکمێك لەسەر جێگیربوونی بۆ هەموو قەزیەیەك کە تێیدا ئەو عیللەتەی تێدا بێت.

٤) قیاس یەکێکە لە گرنگترین وەسائیلەکان لە ئیجتیهاددا، واتە لە موتابەعەکردنی مەسەلە نوێ و تازەکاندا بۆ زانینی حوکمەکانی لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقە.

٥) قیاس وەسیلەیەکی گەڕانەوەیە لە جوزئیاتەوە بۆ کولیاتی (قورئان و سوننەت).

٦) قیاس گرنگییەکی زۆری هەیە لە تەشریعاتە (وضعي)یەکاندا هەرچەندە کە ئەو تەشریعاتانە قابیلن بۆ گۆڕان و ئاڵوگۆڕ، بەڵام قیاس لە شەریعەی ئیسلامیدا گرنگییەکی زۆرتری هەیە، چونکە شەریعەی ئیسلامیی تەنها باسی لە قەواعیدە کولییەکان و مەبادیئە عامەکانی کردووە، تەفصیلات و جوزئیاتەکانی واز لێهێناوە بۆ عەقڵە بەشەرییەکان.

**حوکمی قیاس:**

قیاس حوکمی زۆری هەیە بە گوێرەی بارودۆخ و ئەحواڵ و کەسەکان بەم شێوەیە:

١ـ قیاس واجبێکی عەینییە: لە کاتی ڕوودانی روداوێکی دیارییکراودا کە دەقی لەسەر نییە و لە ناوچەکەشدا یەك قازیی هەبێت، واتە قازیی تر نەبێت.

٢ـ قیاس واجبی کیفائیە: دەبێت ئەگەر ئەو ڕووداوە لە ناوچەیەکدا ڕوو بدات کەچەند قازییەکی تێدا بێت.

٣ـ قیاس مەندوبە: بۆ ئەو مەسائیلانەی کە ڕوویان نەداوە، بەڵام پێشبینیی ڕوودانیان دەکرێت.

٤ـ قیاس حەرامە: ئەگەر کەسێك پێی هەستێت کە مەرجی ئیجتیهادی تێدا نییە.

٥ـ قیاس (خلافي أولى)یە: ئەگەر موجتەهیدێك قیاسێك بکات بە ئامادەبوونی موجتەهیدێکی لە خۆی زاناتر.

٦ـ قیاس موباحە: کە لە ڕووداوە ئاسانەکاندا (أوضاع عادية) وەك بۆ فێربوون و خۆڕاهێنان.

٧ـ قیاس مەکروهە: ئەگەر ئەو قیاسە بۆ خۆدەرخستن و خۆبەزلزانین و موجادەلە و فەخرکردن بێت لە ناو خەڵکییدا.

**إستحسان**

یەکێکی تر لە بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی، بریتییە لە ئیستیحسان، با بزانین ئیستیحسان چییە؟

لە ڕووی زمانەوە (إستحسان) بە مانای بە جوان و باش زانینی شتێك یان کارێکە، بەڵام لە لای زانایانی ئوصوڵی فیقه، چەندین پێناسەی بۆ کراوە، کە ڕەنگە باشترینیان ئەوە بێت کە کەرخی هێناویەتی، کاتێك کە دەڵێت:

أن يعدل الإنسان عن أن يحكم في المسألة بمثل ما حكم به في نظائرها الى خلافه لوجه يقتضي العدول عن الأول [١].

یان بە کورتیی بریتییە لە بواردنی حاڵەتێکی تایبەت لە یاسایەکی گشتیی لەبەر خاتری بەڵگەیەك. واتە کارکردن بە بەڵگەی تایبەت وێڕای بوونی یاسای گشتیی.

بە گوزارەیەکی تر إستحسان جیاکردنەوەی بابەتێکە لە حوکمێکی گشتیی کە هاوچەشنەکانی ئەو بابەتە هەیانە، بەم پێناسەیە إستحسان بەڵگەیەك و سەرچاوەیەکی عەقڵی و لۆجیکیی گرنگە و ئاستی بەرزی وردبینی یاساناسە مسوڵمانەکان نیشان دەدات لەمەڕ دۆزینەوەی چارەسەری واقیعیی بۆ ئەو حاڵەتە تایبەتانەی ڕووبەڕووی شەرعزان و موفتییەکان دەبنەوە و دژوارە یاسای گشتییان بەسەردا پیادە بکرێت. هەندێکی تر وایان پێناسە کردووە کە إستحسان کارکردنە بە قیاسێکی ورد و شاراوە لە بەرامبەر قیاسێکی دیار و ئاشکرا. وەك ئەوەی فوقەها مامەڵەی سەلەمیان بە راست و ڕەوا لە قەڵەمداوە، هەرچەندە بەپێی یاساو پێوانەی گشتیی نابێت ڕەوا بێت، چونکە بریتییە لە فرۆشتنی شتی نەبوو (معدوم)، بەڵام لەبەر ئەوەی دەقی تایبەتی لەسەر هاتووە و کارپێکردنی بەرژەوەندیی خەڵکی تیایە، خودی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێداوە.

لەم پێناسەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە إستحسان چوار پایەیەکی هەیە:

بابەتێکی تایبەت (حادثة جزئية).

یاسایەکی گشتیی (قاعدة عامة).

---

[1] كشف الأسرار : عبدالعزيز البخاري ٤/ ١١٢٣ .

بەڵگەیەکی تایبەت (دلیل خاص).

زانای شەرعزان (المجتهد).

کەواتە هیچ کەسێك جگە لە شەرعزانەکان بۆی نییە لە ڕووی إستحسانەوە حوکمی شەرعیی هەڵێنجێت.

هەروەها بەپێی جۆری بەڵگە تایبەتەکە جۆری إستحسان دەگۆڕێت، ئەو بەڵگەیە مومکینە دەق (فەرموودەی نەبەوی)، ئیجماعی زانایان، قیاس، بەرژەوەندیی، زەڕوورەت یان عورف بێت.

## جۆرەکانی إستحسان:

وەك وتمان إستحسان بەپێی دەلیلەکەی دەبێت بە شەش جۆر بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ إستحسان بەپێی دەق (نص): وەك ئەو نموونەیەی لەسەر سەلەم هێنامانەوە، سەلەم واتە پێشفرۆشی دەغڵ و دان بە پارەیەکی نەقد، کە بەپێی یاسای (لا یجوز بیع المعدوم) نابێت ڕەوا بێت، بەڵام کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ چووە مەدینە و بینیی ئەم مامەڵەیە لە ناویاندا باوە و هیچ زەرەر و زیان و خراپەیەکی لێناکەوێتەوە، بە دەقێکی ڕوون و ئاشکرا مۆڵەتی پێدا و بە ڕەوای دانا.

٢ـ إستحسان بەپێی ئیجماع: بۆ نموونە گرێبەست لەگەڵ دارتاش و ئاسنگەر و هەموو ئەو سەنعەتگەرانەی پێشتر مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت لەسەر دروستکردنی شتێکی دیاریکراو کە لە کاتی عەقدەکەدا بوونی نییە، بەپێی یاسا شەرعییەکان نابێت دروست بێت، بەڵام لە زەمانی صەحابەی کیرامەوە زانایان بە تێکڕا بە ڕەوایان داناوە و هیچ گرفتێکیان تێدا نەدیوە.

٣ـ إستحسان بەپێی زەڕوورەت: وەك بڕیاردان بە پاکیی ئاوی بیرەکان، هەرچەند پیساییشیان تێکەوتبێ، لەبەر زەڕوورەت.

٤ـ إستحسان بەپێی عورف: وەك هەڵاواردنی بابەتێکی هەندەکی (جزئي) لە یاسایەکی گشتیی لەبەر نەریتێکی گونجاوی ناو کۆمەڵگا کە هیچ زیانێکی لێناکەوێتەوە، بۆ نموونە ئەو بڕە پارەیەی کە خەڵك دەیدەن بە خاوەنی گەرماوەکان، لە بەرامبەر ئەو بڕە ئاوەی بەکاری دەهێنن، هەرچەندە بە دروستیی نازانن چەند ئاویان بەکارهێناوە.

٥ـ إستحسان بەپێی بەرژەوەندیی: بۆ نموونە نابێت بە هیچ شێوەیەك دەستكاریی وەدیعە بكرێت، ئەمە یاسایەكی گشتییە، بەڵام لە بەر بەرژەوەندیی ڕێگە دراوە خاوەن ماڵ دەستكاریی وەدیعەی كرێچی بكات، لەبەر بەرژەوەندیی پاراستنی ماڵ و موڵكی خەڵكیی، لە كەمتەرخەمی و دەستتێوەردان.

٦ـ إستحسان بەپێی قیاسێكی شاراوە: نموونەكەی هەڵاواردنی ئەو ژنەی كە مێردەكەی لە نەخۆشیی مەرگدا تەڵاقی دەدات لە یاسای گشتیی تەڵاقدراو میرات نابات، بەپێی قیاسكردنی ژنی تەڵاقدراو لە نەخۆشیی مەرگدا بەو میراتگرەی مەحرووم دەكرێت لە میرات، كەواتە ئەگەر كەسێك لە نەخۆشیی مەرگدا ژنەكەی تەڵاق بدات، بە پێچەوانەی مەبەستەكەی مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت و ژنەكەی میراتی لێدەبات.

**بەڵگەبوونی إستحسان**

بۆ ئەوەی بزانین إستحسان چ پێگە و پایەیەكی هەیە پێویستە لە دوو لایەنەوە سەرنجی بدەین، لە لایەنی فیقهی ئیسلامیی و لایەنی یاساوە.

یەكەم: لە فیقهی ئیسلامییدا:

فوقەها و ئسولزانەكان لەمەڕ بەڵگەبوونی إستحسان و پشت پێبەستنی دوو ڕەوتی جیاوازیان هەیە:

١ـ ڕەوتی جمهور واتە زۆرینە كە بریتین لە زانایانی حەنەفی و مالیكی و حەنبەلی، كە إستحسان بە بەڵگەیەكی شەرعیی دادەنێن و بڕوایان وایە كە إستحسان لە راستییدا كاركردنە بەو بەڵگەیەی بەهێزترە (العمل بأقوى الدليلين)، یاخود بریتییە لە كاركردن بە بەڵگەی تایبەت لەباتی بەڵگەی گشتیی (العمل بدليل خاص مقابل الدليل العام). كە بێگومان لە ڕووی قورئان و سوننەت و سیرەی خولەفای ڕاشیدین و صەحابە و تابیعینەوە، كارێكی ڕەوایە، تەنانەت لە ئیمامی مالیك دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: إستحسان نۆ بەش لە دە بەشی زانستە ـ الإستحسان تسعة اعشار العلم.

٢ـ ڕەوتی ئیمامی شافیعی و زاهیرییە و ئیمامییە: كە پێیان وایە إستحسان بەڵگە نییە و پەیڕەوییە لە هەواو ئارەزوو، جگە لەوەی شافیعی لای وایە كە قیاس بێنیازی كردووین لە إستحسان. هەرچی ئیمامی و زاهیرییەكانیشە لایان وایە كە عموماتی قورئان و ڕواڵەتی ماناكانی بەسن بۆ هەڵگۆزینی ئەحكام، كەواتە پێویستمان بە إستحسان نابێت.

کاتێك لە بەڵگەو بۆچوونەکانی هەردوولا ورد دەبینەوە، دەبینین کە لە ڕاستییدا ئیستیحسان پرۆسەیەکی ئیجتیهادیی ژیرانەیە بە مەبەستی داشکاندن بە لای ئەو بەڵگەیەدا کە بەهێزتر و هەموارترە، واتە کارکردنە بە بەڵگەی حوکمی تایبەت و جیاکردنەوەیەتی لە بەڵگەی حوکمی گشتیی، نەك پەیڕەویکردن بێت لە هەوەس و ئارەزوو، وێڕای ئەو ڕاستییەی کە زۆر جار کارکردن بە یاسای گشتیی حوکمە بنەڕەتییەکان دەبێتە هۆی دژواریی و نارەحەتی و ڕەنج.

دووەم: لە یاسای مرۆڤکردەکاندا:

بێگومان لە یاسای وڵاتانیشدا هەموو ئەو هەموارکردن و گۆڕانانەی لە یاسا و بڕیارە دادوەری و کارگێڕییەکاندا ڕوو دەدەن، لەسەر بنەمای إستحسان و پەیڕەوکردنی پرانسیپەکانی ئەنجام دەدرێن، هەروەها لە یاسادا تیۆرییەك هەیە بە ناوی تیۆری بارودۆخی کتوپڕ (نظرية الأحوال الطارئة) کە تا ئەندازەیەکی زۆر لە بنەمای إستحسان دەچێت، بەپێی ئەم تیۆرییە ئەگەر جێبەجێکردنی گرێبەست لە بەر کارەسات و هۆی چاوەڕواننەکراو دەبووە هۆی زەرەر و زیانێکی قورس بۆ لایەنێکی گرێبەستەکە، ئەوا دەکرێت بە جۆرێك لە جۆرەکان دەستکاریی گرێبەستەکە و تەخفیفی ئیلتیزام بکرێت، کە ئەڵبەتە ئەم تیۆرییە هەڵقوڵاوە لە هەمان مەبەستی یاسایی ڕەچاوکراو لە إستحساندا، کە ئەویش تەحقیقی دادگەرییە لە ناو کۆمەڵدا.

## بەرژەوەندیی ڕەها (المصلحة المرسلة)

یەکێکی تر لەو سەرچاوانەی حوکمی شەرعییان لێ وەردەگیرێت بەرژەوەندیی ڕەهایە، کە پێی دەگوترێ: المصلحة المرسلة.

مەبەست لە بەرژەوەندیی ڕەها ئەوەیە کە بەرژەوندییەکان سێ جۆرن:

١ـ بەرژەوەندیی دانپیانراو: واتە ئەو بەرژەوەندیی و قازانجانەی شەریعەت دەیانپارێزێت و جەختیان لەسەر دەکات و لە ڕوانگەی زانایانی شەرعەوە دەکرێن بە سێ دەستەوە:

زەڕوورییات، حاجییات، تەحسینییات. زەروورییات واتە ئەو بەرژەوەندییانەی ژیانیان لەسەر دادەمەزرێ و بەبێ ئەوان ژیان تێك دەچێت و لەق و لۆق دەبێت، وەك ئایین و گیان و ژیریی و ماڵ و نامووس.

حاجییات واتە ئەو بەرژەوەندییانەی کە ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵگا ئاسان دەکەن و بەبێ ئەوان ژیان سەخت و دژوار دەبێت، وەك ئاوی سازگار و وزەی کارەبا.

تەحسینییات واتە ئەو بەرژەوەندییانەی خۆشیی و فەراخیی و گوزەرانی باشیان پێوە بەستراوە، وەك جادە و ڕێگەوبانی فراوان و پێداویستییە لۆکسەکانی ئەمڕۆ.

ئەم بەرژەوەندییانە لای هەموو زانایان شەرعی و پەسەندن.

٢ـ بەرژەوەندیی ڕەتکراوە: واتە ئەو بەرژەوەندیی و قازانجانەی بە دەقی شەرع ڕەفز کراون، وەك سوود و قازانجی ریبا و گرێبەستە فاسیدەکان و ئارەزووە حەرامەکان، ئەم جۆرە بەرژەوەندییانە لای هەموو زانایان ناشەرعیین.

٣ـ بەرژەوەندیی ڕەها: واتە ئەو سوود و قازانجانەی کە بە دەقێکی ڕاشکاو دانیان پیا نەنراوە یان ڕەت نەکراونەتەوە، وەك ئەو سیستەم و گرێبەست و شمەکە تازانەی دەقێکی تایبەتیان لەسەر نییە، لێرەدا لە ناو زانایاندا ڕای جیاواز دەبینین، زۆربەی زانایان (جمهور) دەڵێن: دەخرێنە پاڵ بەرژەوەندییە دانپیانراوەکان و حسابی مەشروع و ڕەوایان بۆ دەکرێت، بەڵام هەندێك لە زانایان سەریان باداوە و بە لایانەوە ڕەوا نییە بە تەنها بوونی بەرژەوەندیی لە کارێکدا کافیی بێت بۆ ڕەوایەتی ئەو کارە، بەڵام کاتێك سەرنج لە فتوا و بڕیاری فوقەهای مەزهەبەکان دەدەین، دەبینین کە هەر هەموویان مەسڵەحەی مورسەلەیان بە بەڵگەیەکی شەرعیی زانیوە، بەڵام ناوی جیاوازیان لێناوە، بۆ نموونە حەنەفییەکان لە ژێر

ناوی إستحسان دا و شافیعییەکان لە دووتوێی باسی قیاسدا، لە ژێر باسی وەصفی مناسبی مورسەلەدا ئاماژەیان پێکردووە. شیعەکان بە ڕواڵەت مەسڵەحەی مورسەلەیان ڕەت کردووەتەوە، بەڵام ئەمانیش لەژێر ناوی دەلیلی عەقڵیی و لە هەناوی باسی حوسن و قوبحی عەقڵییدا پشتیان پێبەستووە.

بەڵام لەناو مەزهەبەکاندا زیاتر مالیکی و پاش ئەوان حەنابیلە پشتیان بەم بەڵگەیە بەستووە.

**نەریت (العرف)**

یەکێکی تر لە سەرچاوەکانی یاسا و فیقهی ئیسلامیی بریتییە لە نەریت (العرف)، عورف لە زماندا بە ماناگەلی بەخشش، عادەت و چاکەکردن هاتووە، لە زاراوەی زانستمەندانی ئوصولّی فیقهدا بریتییە لە گوفتار و کرداری پەسەندی ناو خەلّك، ئیمامی غەزالی لە پێناسەیدا فەرموویەتی:

ما إستقر في النفوس من جهة العقول و تلقته الطباع السليمة بالقبول.

واتە ئەو شتەیە کە لە دەروونی مرۆڤەکاندا لە ڕووی ژیرییەوە جێگیر بووە و سروشتە ساغ و دروستەکان وەریانگرتووە و پەسەندیان کردووە.

**جۆرەکانی عورف:**

یەکەم: لە ڕووی ماك و جەوهەرەوە، عورف یا قەولییە یان عەمەلییە، هەرکام لەمانەش یان گشتییە یان تایبەت، کەواتە چوار جۆر عورفمان هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ عورفی قەولیی گشتیی: وەك زمان و گفتوگۆی ناو مەردوم.

٢ـ عورفی قەولیی تایبەت: وەك زمان و زاراوەی بەکارهاتووی نێوان گرووپێکی تایبەت و توێژێکی دیارییکراو.

٣ـ عورفی عەمەلیی گشتیی: وەك عادات و تەقالیدی ناو خەلّکیی.

٤ـ عورفی عەمەلیی تایبەت: وەك عادات و تەقالیدی تایبەتی ناو پزیشکان و پارێزەران و بازرگانان.

**بەلّگەبوونی عورف**

زانایان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە عورف گرنگییەکی تەواوی هەیە لە یاسادانان و پراکتیزەکردنیدا، ئەگەر جیاوازییەك هەبێت لە ئەندازەی پشتپێبەستنیایەتی لە پرۆسەی هەلّێنجانی بڕیاری شەرعییدا، لە ناویشیاندا حەنەفی و شافیعییەکان پتر لەوانی تر حسابیان بۆ کردووە، لەم سۆنگەیەوە بۆ پراکتیزە کردنی ئەحکامی شەرعی و تەنانەت گۆڕینی ئیجتیهاداتی سەردەم عورف گرنگییەکی تەواوی هەیە، هەر بۆیە گوتراویشە: لا ينكر تغير الأحكام بتغير الأعراف و الأزمان.

لە یاسای وەزعییشدا عورف ڕۆلّێکی گرنگ و جومگەیی دەبینێت و بە سەرچاوەی یەکەمی یاسادانان دادەنرێت و لە دادوەرییدا دوای دەقی یاسایی حساب بۆ عورف دەکرێت.

چەند نموونەیەکی فیقهی دامەزراو لەسەر عورف:

شەرعزانەکان حوکمی زۆر بابەتیان لەسەر بنەمای عورف دیارییکردووە، لەوانە گرێبەستی إستصناعیان بە ڕەوا داناوە، لەبەر ئەوەی لە عورفی خەڵکدا کاری پێکراوە، هەرچەندە گرێبەستە لەسەر شتی نەبوو (عقد على شيء معدوم).

لەوانە بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە کەل و پەلی ناوماڵ ئەگەر پێش گواستنەوە کڕدرا بۆ ژنە، بەپێی عورف.

هەروەها فرۆشتنی میوە و سەوزیجات پێش ئەوەی بەتەواویی بگەن، لە ڕووی عورفەوە، ڕەوایە. هەرچەندە هێشتا بوونی تەواویان نییە.

نموونەیەکی تر پابەندبوونی کۆمپانیاکانی شتومەکی کارەباییە بە چاککردنەوەیان بۆ ماوەی ساڵێك، بەپێی عورفی بازرگانیی ناو خەڵك، وێڕای ئەوەی کە نەهیی کراوە لە مامەڵەی بەمەرج (النهي عن بيع وشرط)، چونکە هیچ کێشە و هەرایەکی لەسەر دروست نابێت.

پێشەوا محەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی وەقفی ماڵی گواستراوەی بە جیا لە عەقاری بە ڕەوا داناوە، بەپێی عورفی خەڵکیی، هەرچەندە پێویستە وەقف بۆ هەمیشە بێت.

## مەزهەبی صەحابی

بەڵگەو سەرچاوەیەکی تری فیقهی ئیسلامییە بەو مەرجەی صەحابییەکە فەقیهو شەرعزان بێت. دەبێ ئەوەش بزانین لە پێناسەکردنی صەحابیدا لە نێوان موحەددیسین و ئوصولێییەکاندا ڕای جیاواز هەیە.

موحەددیسین دەفەرموون: صەحابی ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوای ﷺ دیبێ و بە ئیمانەوە مردبێ، کەواتە ئەگەر بۆ ساتێکیش بە خزمەتی گەشتبێ بەو مەرجەی بە مسوڵمانێتی مردبێ کافییە بۆ ئەوەی حسابی صەحابەی بۆ بکرێت، دیارە مەبەستیان لە پێناسەی صەحابی بۆ ئەوەیە کە قبوڵی ڕیوایەت و گێڕانەوەکانی بکرێت.

هەرچی ئوصولێییەکانە صەحابی بەو کەسە دەڵێن کە ماوەیەکی درێژ لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺدا بووبێت و بە بڕواوە مردبێت، واتە ئەوەندە هاوڕێیەتی کردبێت کە لە ڕووی عورفەوە حسابی هاوڕێیەتی بۆ بکرێ و پێی بگوترێ: صاحیب. دیارە ئەمان مەبەستیان دیاریکردنی ئەو کەسانەیە کە بتوانن فتوا بدەن لە شەرعدا، بۆیە بە تەنها بینینی ڕەسوولی ئەکرەم بە کافیی نازانن بۆ ئەوەی کەسێك بە خاوەن مەزهەب بزانن، لە ئەنجامی ئەم جیاوازییەدا بۆمان دەردەکەوێت، مەبەست لە مەزهەبی صەحابی لای ئوصولێین، ڕاو تەگبیری ئەو ژمارەیە لە یارانی پێغەمبەر کە ئەهلی فتوا بوون، وەك خولەفای راشیدین و ئیبن مەسعوود، ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر، ئەبودەردا و ئەبوسەعیدی خودری و زەیدی کوڕی سابیت و...هتد، کە هەڵگری زانست و فەرموودەکانی نەبەوی بوون و خەڵك داوای فتوای شەرعییان لێدەکردن.

### بەڵگەبوونی مەزهەبی صەحابی

بێگومان زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە مەزهەبی صەحابی نابێتە حوججە بەسەر صەحابییەکی ترەوە، چونکە ئەگەر وابایە نەدەبوو لە ناو خودی صەحابییەکاندا ڕای جیاواز لەسەر بابەتەکان هەبێ، ئەوەی جێی مشتومڕە لە ناویاندا ئەوەیە ئایا مەزهەبی صەحابی دەبێتە حوججە لەسەر موجتەهیدینی دوای ئەصحاب، واتە ئایا موجتەهید بۆی هەیە رایەك بە پێچەوانەی مەزهەبی صەحابی دەربڕێت؟ یان بۆی نییە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا سێ بۆچوونی جیاواز هەیە:

١ـ بۆچوونی ئیمام مالیك، زۆربەی حەنەفییەكان و قەولی قەدیمی ئیمامی شافیعی و ئیمام ئەحمەد و زۆرینەی حەنابیلە و ئیمامی ڕازیی و شاتیبی كە مەزهەبی صەحابی بە هەر شێوەیەك بێت حوججەیە و پێش دەخرێت بە سەر قیاسدا، چونكە ئەگەر بتوانین بڵێین لە پێغەمبەری بیستووە ئەوە دەبێتە بەشێك لە سوننە و ئەگەر بڵێین بە ئیجتیهادی خۆیەتی، ئەوا ئەو ئیجتیهادەی ئەو بەهێزترە لەهەر ئیجتیهادێكی تر، لەبەر ئەوەی صەحابی خاوەنی خواناسیی و پارێزێكی وایە كە لە فتواكانیدا ئەوپەڕی دوای بەڵگەی متمانەپێكراو دەكەوێت و متمانەمان بە دینداریی و حەقخوازیی ئەو لە هی یەكێكی تر زیاترە.

٢ـ بۆچوونی موعتەزیلە و هەندێك لە موتەكەللیمین و قەولی جەدیدی ئیمامی شافیعی ڕیوایەتێكی تر لە ئیمامی ئەحمەدەوە و كەرخی حەنەفی و ئامیدی لە شافیعییەكان و شەوكانی و هەروەها شیعەش، رایان وایە مەزهەبی صەحابی تەنها ئیجتیهادێكە و هیچ ئیلزامێكی تیا نییە بۆ موجتەهیدی تر، هەرچەندە پلەو پایەی مەعنەویی صەحابە زۆر بەرزە و كەسانی تری پێناگات.

٣ـ بۆچوونێكی تر هەیە دەدرێتە پاڵ ئیمامی شافیعی كە ئەگەر مەزهەبی صەحابی پێچەوانەی قیاس و قاعیدەی كوللیی بێت ئەوە حوججەتە و مولزیمە بۆ غەیری خۆی، چونكە هیچ كاتێك صەحابی نایەت موخالەفەی قیاس بكات ئەگەر پشت ئەستوور نەبێت بە شتێك كە لە پێغەمبەری بیستووە یا دیتووە، كەواتە ئەگەر موافیقی قیاس بوو ئەوا ئیجتیهادی صەحابی تەنها دەبێتە بۆچوونێك و ئیلزامی تیا نابێت لەسەر كەس.

## شەریعەتەکانی پێشین

یەکێکی تر لەو سەرچاوە تەشریعییانەی ئوصولێیەکان ئاماژەیان بۆ کردووە، شەریعەتەکانی پێشینە کە پێی دەگوترێ: (شرع من قبلنا).

پێناسەکەی: مەبەست لە شەریعەتەکانی پێشین ئەو یاسا و ڕێسایانەیە کە خوای پەروەردگار لە ڕێی پێغەمبەرانی خۆیەوە بە تایبەت ئیبراهیم و موسا و داوود و عیسا (سەلامی خوایان لێبێت) ناردوونی بۆ خەڵك.

**جۆرەکانی:**

ئەو یاسایانەیە بە گشتیی دەبن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: ئەو یاسایانەی لە کیتاب و سوننەتدا ئاماژەیان بۆ نەکراوە، کە بێگومان بە کۆڕای شەرعزانەکان ئەمانە نابن بە سەرچاوەی یاسایی بۆ ئێمە.

دووەم: ئەو یاسایانەی کە لە قورئاندا یاخود لە سوننەتدا باسکراون، ئەمەش بۆ خۆی سێ دەستەیە:

١- ئەو یاسایانەی بە دەقی ئاشکرا نەسخ کراونەتەوە، وەك ئەوەی لە ئایەی (١٤٦) سوڕەی ئەنعامدا هاتووە و باسی حەرامکردنی گۆشتی باڵندەی چڕنووکدار و ئاژەڵی سمدار و پیوو چەوریی دەوری ورگ، جگە لە کۆڵەپشت (دووگ)ی حوشتر و ڕیخۆڵەکانی دەکات، کە دەفەرموێ: (وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ) (الأنعام : ١٤٦). ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە ئایەتی: (قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ) (الأنعام : ١٤٥).

بێگومان ئەم دەستەیە بە لای کۆی زانایانەوە نابێتە شەرع بۆ ئێمە، چونکە بە ڕاشکاویی باس لە نەسخیان کراوە. نموونەیەکی تر حەرامبوونی غەنائیم واتە دەسکەوتەکانی جەنگە لە ئایینەکانی پێشوودا، کە بێگومان لە ئایینی ئیسلامدا حەڵاڵ کراوە، نموونەیەکی تر خۆکوشتنە بۆ تۆبەکردن، کە زووتر ڕەوا بووە و ئێستا ڕەوا نییە، هەروەها لە ئایینەکانی پێشوودا ئەگەر پارچەیەك پیس ببایە دەبوو بیبڕن کە دیارە لە ئایینی ئیسلامدا ئەم حوکمە نەماوە.

٢ـ ئەو یاسایانەی بە دەقی ئاشکرا هێڵراونەتەوە و جێگیر کراون، وەکو ڕۆژووگرتن، بەپێی ئایەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) (البقرة : ١٨٣ )، هەروەها قوربانییکردن، بەپێی فەرموودەی: ضحوا فإنها سنة لبيكم إبراهيم.

٣ـ ئەو یاسایانەی باسکراون، بەڵام دەقێك نییە کە باس لە جێگیرکردن یان هەڵوەشاندنەوەیان بکات، وەك ئەو ئایەتەی باس لە قیصاصی ناو گەلی یەهوود دەکات، ئایەتەکەش ئەمەیە: (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ) (المائدة : ٤٥). هەروەها وەك دابەشکردنی ئاو لە ناو گەلی سەمووددا، وەك لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکراوە: (وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاء قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ) (القمر : ٢٨)، ئەم جۆرەیان لە ناو زانایاندا ڕای جیاوازی لەسەرە، زۆربەی زانایانی حەنەفی، مالیکی و هەندێك شافیعییان و ڕیوایەتێکی بەهێز لە ئیمامی ئەحمەدەوە کە ئەگەر شەرعی پێشینان لە ڕێگای قورئان و سوننەوە بگاتە دەستمان، نەك لە ڕێگەی کتێبەکانی خۆیانەوە، بەڵام ڕای فتواپێدراوی شافیعییە و ئەشاعیرە و موعتەزیلە و شیعە ئەوەیە کە شەرعی پێشینان شەرع نییە بۆمان.

بە هەڵسەنگاندنی بەڵگەی هەر دوولا ئەوەمان لا گەڵاڵە دەبێت کە شەرعی پێشینان بەڵگەیەکی سەربەخۆی تەشریع نییە و کارپێکردنی لقێکە بۆ کارکردن بە کیتاب و سوننە.

## ڕێگرتن لە حەرام ( سد الذرائع )

کاتێك سەرنج لە نوسراوەکانی ئوصولّی فیقه دەدەین، وشەی سەددی زەرائیع دەبینین، دەبێ بزانین مەبەست لە زەریعە ئەو ئامراز و ئەو ڕێگایەیە کە سەری لە حەرامەوە دەردەچێت، کەواتە سەددی زەرائیع واتە ڕێگرتن لە حەرام، هەر بۆیە زانایان لە پێناسەکردنیدا فەرموویانە:

**هو منع كل ما يتوصل به الى الشيء الممنوع المشتمل على مفسدة أو مضرة**، کەواتە هەرچی ببێتە هۆی حەرامێك خۆیشی حەرام دەبێت، وەك چۆن موقەددیمەی واجب واجب دەبێ. واتە وەسیلەی هەر شتێك بە پەیڕەوی لە ئەنجام و ئامانجەکەی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ. بۆ نموونە فاحیشە حەرامە، کەواتە هەرکارێکیش لە باریدا هەبێت کە ببێتە سەرەتایەك بۆی ئەویش هەر حەرامە.

نموونەیەکی تر، پێ بەزەویداکوتانی ئافرەتە کە دەبێتە هۆی هەستکردن بەو خشڵ و زیوەرانەی شاردراوەنەتەوە، کە ئەمەش لە باریدایە ببێتە فیتنە بۆ پیاو، وەك لەم ئایەتەدا ئەخوێندرێتەوە: (وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ) (النور : ٣١). لە ئایەتێکی تردا ڕێگریی کراوە لەوەی مسوڵمانان جنێو بە بتی موشریکین بدەن، تا ئەوانیش لە کاردانەوەدا جنێو بە پەروەردگار نەدەن، (وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ) (الأنعام : ١٠٨)، چونکە زۆر ڕێی تێدەچێت، کافران لە کاردانەوەی سووکاتیکردنی بڕواداران بە بتەکانیان ئەوانیش سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئەمان بکەن.

**جۆرەکانی زەرائیع:**

ئیمامی شاتبی زەریعە واتە ئامرازەکانی کردووە بە چوار بەشەوە:

١ـ ئەو ئامرازەی کە بێگومان خراپەیەکی لێدەکەوێتەوە، وەك ئەوەی کەسێك لە پشتی دەرگایەکەوە چاڵێك هەڵبکەنێت کە هەرکەسێك لەو دەرگایە بچێتە ژوورەوە تێی بکەوێت، ئەم کارە بە هەموو شێوەیەك ناڕەوایە و ڕێی پێنادرێت، ئەگەر کەسێکیش بیکات حسابی تەعەددای بۆ دەکرێت و دەبێ زەرەر و زیانەکان ببژێرێت.

٢ـ ئەو ئامرازەی بە دەگمەن خراپەی لێدەکەوێتەوە، وەك هەڵکەندنی بیرێك لە شوێنێکدا کە بەدەگمەن خەڵکی تێبکەوێت، یان فرۆشتنی خۆراك کە بە دەگمەن زەرەر و زیانی هەبێ، ئەمە ڕێی پێدراوە و گوێ نادرێتە ئەو ئیحتیماڵە لاوازەی کە ڕەنگە زیانی لێبکەوێتەوە.

٣ـ ئەو ئامرازەی بە ئیحتیماڵی زۆر زەرەرو زیان و خراپەی لێدەکەوێتەوە، وەك فرۆشتنی چەك بە دوژمنان و ترێ بە خەممار واتە (شەرابساز)، ئەمە بە ڕای هەموو زانایان قەدەغەیە و ڕێگەی پێنادرێ.

٤ـ ئەو ئامرازەی زۆر جار خراپەی لێدەکەوێتەوە وەك مامەڵە بۆ ماوە (بیوع الآجال)، ئەم مامەڵەیە بەڕواڵەت ئەبێ دروست بێت، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ڕێگایەکە بۆ ریبا، هەر بۆیە لای مالیکی و حەنبەلییەکان قەدەغەو حەرامە، چونکە زۆر جار ئەو ئەنجامە خراپەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام لای شافیعی ڕەوایە، بە بەڵگەی ئەوەی پێویستە حساب بۆ ڕواڵەتی گرێبەستەکە بکرێ و مەرج نییە هەموو ئەوانەی ئەم مامەڵانە دەکەن مەبەستیان ریبا و بەهرە بێت.

**ڕای زانایان لەسەر بەڵگەبوونی سد الذرائع**

ڕێگرتن لە خراپە (سد الذرائع) لای زانایانی مەزهەبی مالیکی و حەنبەلی بە سەرچاوەیەکی یاسادانان دادەنرێت، بەڵام لای شافیعی و ئەبوحەنیفە هەندێك جار بە سەرچاوە دادەنرێت، وەك لە سەرچاوە و فتوا فیقهییەکانیانەوە دەردەکەوێت، بەڵام لە هەندێك بواری تردا بە سەرچاوەی تەشریعیی دانانرێت. جیاوازییەکەش لە راستییدا لەسەر ئەو کارانەیە کە لە خودی خۆیاندا ڕەوان، بەڵام مەبەست و ئەنجامی ناڕەوایان لێدەکەوێتەوە، وەك ئەو نموونانەی کە باسمان کردن.

**إستصحاب**

إستصحاب له زماندا به ماناى ويستنى هاوڕێیەتی هاتووه، بەڵام له زاراوەی ئوصولى فيقهدا بريتییه له هێشتنەوەی حوكمى زەمانى پێشوو وەك خۆى له بەر نەبوونى بەڵگە لەسەر گۆڕانى له زەمانى دواتردا. وەك شيخ عبدالوهاب خلاف دەڵێت:

هو الحكم ببقاء الحكم في الزمان اللاحق بدليل ثبوته في الزمان السابق حتى يرد دليل بخلافه. واته ئەگەر حوكمى شەرعيى له كاتێكى پێشوودا هەبوو، دواتر گومانمان بۆ دروست بوو له سەرى كه ئايا ئێستا ئەو حوكمه ماوه يان نا؟ لەو حاڵەتەدا بڕيار دەدەين به مانەوەی ئەو حوكمه وەك خۆى، چونكه هيچ بەڵگەيەكمان به دەستەوه نييه لەسەر گۆڕانى. كەواته هەر كەس ئيددیعای پێچەوانه بكات، پێويسته بەڵگه بهێنێتەوه لەسەر گۆڕانى ئەو حوكمه، بۆيه هەميشه موددەعى داواى بەڵگه واته بەيينەی لێدەكرێت، لەبەر ئەوەی ئيددیعای شتێك دەكات به پێچەوانەی ڕواڵەتى واقيعەوه و خاوەنى هەڵوێستێكى بێهێزه و پێويست دەكات به دەليل خۆى بەهێز بكات. بەڵام (مدعي عليه) كه بەرامبەرەكەيەتى تەنها داواى سوێندى لێدەكرێت، لەبەر ئەوەی شتێك ناڵێت كه پێچەوانەی واقيعى مەلموس بێت.

**نموونەی فيقهيى لەسەر إستصحاب:**

١ـ شافيعييەكان دەڵێن: هەرشتێك له جەسته دەربچێت له غەيرى پاش و پێشەوه، نابێته هۆى شكاندنى دەستنوێژ، به بەڵگەی ئەوەی ئەو كەسه له پێش ئەو حاڵەتەدا دەستنوێژى هەبووه به ئيجماع، هەنووكه ئەگەر شتێك له كونێكى سكيەوه بێته دەرەوه چونكه بەڵگەمان به دەستەوه نييه، لەسەر شكانى دەستنوێژەكەی، ئەوا حوكم به مانەوەی دەستنوێژەكه دەدەين تا بەڵگەی تەواومان دەست دەكەوێت، (الأصل بقاء ماكان على ما كان).

٢ـ كەسى مەفقوود واته ناديار و بزر كه هيچ هەواڵێك لەسەر مان و نەمانى نييه، موڵك و سامانەكەی ناچێت بۆ ميراتگرەكانى، لەبەر حسابكردن بۆ ژيانى پێشووى واته به إستصحاب و هێشتنەوەی حوكمى ژيانى، چونكه ناتوانين به مردووى دابنێين تا بەڵگەی تەواومان بەدەستەوه نەبێت.

**جۆرەکانی إستصحاب:**

إستصحاب چەند جۆرێکی هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١ـ إستصحابی حوکمی ئیباحەی ئەسڵی: واتە گەڕانەوە بۆ ئەو یاسا گشتییەی کە زۆرینەی ئوصولزانەکان جێگیریان کردووە، کە هەر شتێکی بەسوود ڕەوایە مەگەر بەڵگەیەکی تایبەت هەبێت لەسەر ناڕەوابوونی، بەپێی ئەو ئایەتە پیرۆزەی: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً) (البقرة : ٢٩)، لە هەمان کاتدا هەموو شتێکی زیانبەخشیش ناڕەوایە مەگەر بەڵگەیەکی تایبەت ڕێی پێبدات، لە ڕووی فەرموودەی دروستی نەبەوی: لا ضرر و لا ضرار. واتە زیان و زیان گەیاندنی بەرامبەر بە هیچ جۆرێك ڕەوا نییە. ئەم جۆرە لە إستصحاب لای هەموو زانایان بەڵگەیەکی شەرعییەو کاری پێدەکرێت.

٢ـ إستصحابی عەدەمی ئەسڵیی یان بەرائەتی ئەسڵیی: واتە حوکم بە نەبوونی تەکلیف لەسەر مرۆڤ لەو حاڵەتانەدا کە گومان لە بوونی تەکلیف هەیە، کەواتە ئەگەر کەسێك ئیددیعای کرد کە کەسێکی دیارییکراو قەرزاریەتی، چونکە داوای شتێکی پێچەوانەی ئەسڵ دەکات پێویستە بەڵگەیەکی پێبێت، کە ئیسپاتی ئەو قەرزەی پێبکات، ئەگەر وانەبێت، مادام لە بنەڕەتدا کەس قەرزاری کەس نییە، نموونەیەکی تر ئەگەر دوو کەس شەریك بوون لە کاسبییەکدا، یەکێکیان وتی: خێرمان نەکردووە، ئەوە قسەکەی لێوەردەگیرێت، تاوەکو بە بەڵگە خێرەکەی لەسەر ئیسپات دەبێت. ئەم جۆرەش لە إستصحاب لای زانایان بە تێکڕایی بەڵگەیەو کاری پێدەکرێت.

٣ـ إستصحابی حوکمێکی شەرعی ئەگەر گومان هەبوو لەسەر مانەوەو بەردەوامبوونی. وەك مانەوەی موڵکایەتی پاش ئەوەی کە سەبەبی عەقدەکە بوونی هەبووە، مانەوەی پاکیی و دەستنوێژ پاش دڵنیابوونی یەکەمجار لێی. ئایا گومانکردن پاش جێگیربوونی حوکم کاریگەریی هەیە لەسەر مانەوە و بەردەوامیی ئەو حوکمە؟ ئەم جۆرە هەرچەندە إبن القیم فەرموویەتی زانایان کۆکن لەسەری، بەڵام لە ناو کتێبە ئوصولییەکاندا رای جیاوازی لەسەرە، زۆرینەیان وەك شافیعییەو حەنابیلە پەسەندیان کردووە، لە هەموو حاڵەتێکدا چ بۆ هێشتنەوەی حوکم و مافێکی جێگیر و چ بۆ سەلماندنی مافێکی تازە، واتە بۆ دەفعیش و بۆ ئیسباتیش. بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن: إستصحاب تەنها بۆ دەفع دەشێت نەك بۆ ئیسپات،

واتە بە إستصحاب قسەی ئەو کەسانە ڕەتدەکرێتەوە کە داوای گۆڕینی حوکمێکی پێشوو دەکەن، بەڵام ناتوانرێت بکرێتە بەهانە و بەڵگە بۆ سابتکردنی مافێك کە زووتر بوونی نەبووە، کاریگەریی ئەم جیاوازییەش لە حاڵی مەفقووددا ڕەنگ دەداتەوە. بە لای حەنەفییەکانەوە دەتوانین بەپێی إستصحاب لە کاتی نادیاربوونیدا هەر بە زیندووی بزانین، ماڵ و موڵکی دابەش نەکەین بەسەر واریسەکانیدا و هاوسەرەکەی هەر بە هاوسەری ئەو بزانین، واتە هەموو ئەو مافانەی پێش ونبوونی هەیبوون بۆی بهێڵینەوە، بەڵام ناتوانین مافی تازەی بۆ بسەلمێنین، وەك بڵێین میرات لە خزمە مردووەکانی دەبات یان ئەگەر وەسیەتێکی بۆ کرابێت، لەو وەسیەتە بەهرەمەند دەبێت، بەڵام بە لای جمهورەوە بەڵێ میراتی لێ نابرێت و ژنەکەی هەر لە عیسمەتیدا دەمێنێت، بەڵام بۆی هەیە میراتگری مردووەکانی بێت لەو قۆناغەدا و بەهرەمەندیش ببێت لەو وەسیەتانەی بۆ دەکرێن.

**بەڵگە بوونی إستصحاب**

کەواتە بە شێوەیەکی گشتیی إستصحاب بە لای زۆرینەی زانایانەوە بەڵگەیەکی شەرعییە[1]، جگە لەوەی حەنەفییەکان لە جۆری سێیەمدا جیاوازییەکیان هەبوو لە جمهور و تەنها لە مەقامی ڕەتکردنەوەی دەعوای گۆڕانی حوکمدا پێی قایل بوون. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە زانایان گوتوویانە: الإستصحاب آخر مدار الفتوی. واتە تەنها کاتێك ڕوو لە بەڵگە و قاعیدەی إستصحاب دەکرێت، کە هیچ بەڵگە و قاعیدەیەکی ترمان بە دەستەوە نەبێت.

جیاوازییەکی تر هەیە لەمەڕ إستصحاب، جێی خۆیەتی ئاماژەی بۆ بکەین، ئەویش ئەوەیە کە لای زانایانی ئەهلی سوننەت إستصحاب دەلیلێکی ئیجتهادییە لە درێژەی دەلیلەکانی تردا، کەچیی زانایانی شیعەی ئیمامی دایانناوە بە دلیلێکی فەقاهەتی، واتە بنەمایەکی کردەیی بۆ ڕەهابوون لە حاڵەتی گومان لە کاتی پراکتیزەکردنی حوکمی شەرعیدا، واتە ئەمانیش پاش دەست نەکەوتنی دەلیلی شەرعیی ڕووی تێدەکەن. ئەم جیاوازییەش وەك دەردەکەوێت، جیاوازییەکی ڕواڵەتییەو هیچ لە جەوهەر و ناوەڕۆکی إستصحاب ناگۆڕێت.

---

[1] ئەڵبەتە ژمارەیەك لە زانایانی کەلام و ئەبولحوسێنی بەصری و پێشینانی حەنەفی ئیستصحابیان ڕەت کردوەتەوە، هەرچەندە هەندێکیان بەکاریان هێناوە بۆ تەرجیح .

## ئیجتیهاد و تەقلید

مەردوم لە بەرامبەر ئەحکامی شەرعییەوە دەبن بە سێ دەستەوە:

١ـ موجتەهیدین، ئەو کەسانەی دەتوانن راستەوخۆ لە ڕووی سەرچاوە شەرعییەکانەوە حوکمی شەرعیی دەربهێنن.

٢ـ زانایان، ئەو کەسانەی کە دەتوانن لە ڕووی قسەی موجتەهیدینەوە بۆ خەڵکانی تر و خۆیان فتوا بدەن.

٣ـ عەوام، واتە زۆرینەی خەڵك، کە نە خۆیان موجتەهیدن و نە دەتوانن لە دەلیلی موجتەهیدین شارەزا بن.

هەرکام لەم دەستانەش کاتێك ڕووبەڕووی کێشەیەك یان پرسێك دەبنەوە، ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە. موجتەهید واجبە لە سەری ئیجتیهاد بکات و بۆی نییە تەقلید بکات.

زانا بۆی هەیە ئیجتیهاد بکات بەپێی ئیحتیات و ڕەچاو کردنی بنەما و مەرجەکانی یەکێك لە موجتەهیدین، کەسانی عەوامیش پێویستە دوای موجتەهید یان زانایەکی بڕواپێکراو بکەون، بۆ ئەوەی لە ڕووی دینداریییەوە زیانمەند نەبن.

کەواتە لە نێوان ئیجتیهاد و تەقلیددا پلەیەکی ناوەڕاست هەیە ئەویش پلەی پەیڕەوییە واتە ـ إتّباع ـ، کە هی ئەو کەسانەیە کە دەتوانن لە دەلیل و بنەماکانی موجتەهید شارەزایی پەیدا بکەن.

پێناسەی ئیجتیهاد: لە ڕووی زمانەوە ئیجتیهاد چاوگێکە لە جوهد یان جەهد وەرگیراوە بە مانای کۆشش کردن و ڕەنج کێشان، بەڵام لە زاراوەی زانایاندا بریتییە لە تێکۆشانی تەواو بۆ دۆزینەوەو هەڵێنجانی حوکمی شەرعیی لە ڕووی سەرچاوە و بنەما شەرعییەکانەوە. واتە زانین و شارەزا بوون لە ئەحکام و عیلەلی ئەحکام و ئامانجەکانی شەرع.

**پایەکانی ئیجتیهاد:**

کەواتە ئیجتیهاد چوار پایەی هەیە:

١ـ کەسی موجتەهید: کە پێویستە کەسێکی شارەزا بێت لە کیتاب و سوننە و ئیجماع و قیاس و هەموو سەرچاوەکانی تر و ئاگاداری ژیان و باری سیاسی و کۆمەڵایەتی ناوخەڵك بێ و خواناس و پارێزگار و شارەزای زمانی عەرەبی و وردەکاریییەکانی بێت.

٢ـ بابەتی ئیجتیهادتیاکراو: کە پێویستە بابەتێکی ئیجتیهادیی بێت واتە بکەوێتە ناو ریزبەندیی فیقهی کردەیی و ئاکارییەوە، بە عیبارەتێکی تر زووتر لە لایەن زاناکانەوە بڕیاری قەتعیی لەسەر نەدرابێت.

٣ـ سەرچاوە و بەڵگەی فیقهیی: کە پێویستە ئەو سەرچاوانە بن کە لە لایەن زانا و ئوصولییەکانەوە دانیان پیانراوە.

٤ـ بەڵگە هێنانەوە: کە پێویستە بەڵگەهێنانەوەیەکی راست و دروست بێت لە ڕووی ناوەرۆك و فۆرمیشەوە. بەڵگەش کاتێك لە ڕووی ناوەرۆکەوە راستە کە لەگەڵ بابەتەکەدا بگونجێت و پەیوەندییەکی بەتینی پێوە هەبێت. کاتێکیش لە ڕووی فۆرمەوە تەواوە، کە لۆجیکی زانایانی پێوە بێ و لەسەر مەنهەجێکی دیارییکراو بێت.

**جۆرەکانی ئیجتیهاد:**

لای زانایانی ئوصولێ چوار جۆر ئیجتیهاد باس کراوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

ـ ئیجتیهادی موتڵەق: واتە وەرگرتنی حوکمی شەرعیی، بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە کیتاب و سوننەت، وەك ئیجتیهادی ئەبوحەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەد رەزای خوایان لێبێت.

ـ ئیجتیهادی ناو مەزهەب: واتە هەڵگۆزینی حوکمی شەرعیی لەبەر ڕۆشنایی قەواعیدی فیقهیی ناو مەزهەبێکی تایبەت، وەك ئیجتیهادی سەرەخسی لە ناو حەنەفییەکان و نەوەوی و رافیعی لە شافیعییەکاندا.

ـ ئیجتیهادی فەتوایی: واتە تێکۆشانی زانا بۆ دەرهێنانی حوکمی شەرعیی بابەتێکی تایبەت، لە چوارچێوەی بیروبۆچوونی زانایانی ناو مەزهەبێکی تایبەت، وەك ئیجتیهادی ئیبن حەجەر و رەملی لە رووی گۆشەنیگای پێشینانی خۆیانەوە.

ـ ئیجتیهادی تەرجیحدان: وەك ئەوەی زانایەك لە بیروڕاو ئیجتیهاداتی پێشینان یەکێکیان بە باشتر و بەهێزتر لە قەڵەم بدات، وەك ئیجتیهاداتی پێنجوێنی و قەرەداغی و نۆدشی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە هەڵبژاردنی فەتوای مەزهەبی شافیعییدا.

چەند بڕیارێك لەسەر ئیجتیهاد:

١ـ ئیجتیهاد بە نیسبەت کەس و هەل و مەرجی جیاوازەوە، حوکمی جیای هەیە. بە نیسبەت موجتەهیدەوە فەرزی عەینە، بە نیسبەت ئاحادی ئوممەتەوە فەرزی کیفایەتە، بە

نیسبەت خەڵکی عەوامەوە حەرامە، بۆ یەکێك کە لە خۆی زاناتر هەبێت خیلافی ئەولا یان مەکرووهە و بۆ کەسێك کە لە توانایدا هەبێت مەندووبە. وردەکاری و درێژەی ئەم باسە لە کتێبە گەورەکاندا جوانتر ڕوون کراوەتەوە.

٢ـ نابێت و ناشێت زەمانێك بەسەر ئوممەتدا تێبپەڕێت کە موجتەهیدیان تێدا هەڵنەکەوێت، چونکە عینایەت و لوتفی ئیلاهی هەمیشە وەهایە کە ئەم ئوممەتە موجتەهید و زانای موجەددیدی لێنەبڕێت. ئەمە باسێکە لە کتێبە ئوصولێییەکاندا بە باسی (عدم جواز خلو الزمان من المجتهد) ناوزەد کراوە.

٣ـ ئیجتیهاد قابیلی دابەش کردنە، واتە دەگونجێت کەسێك تەنها لە بوارێکی فیقهو شەرعدا یان چەند باسێکی دیارییکراودا توانای ئیجتیهادی هەبێت، بۆ نموونە تەنها لە فیقهی عیباداتدا یان لە بابی بەیع و ئیجاردا، کە ئەمە لە ناو زانایاندا رایەکی ئێجگار پەسەندە و لە ژێر ناونیشانی (تجزؤ الإجتهاد) ئاماژەیان پێداوە و زۆر لەو عورفە زانستی و ئەکادیمییەی ئەمڕۆ دەچێت کە پێی دەگوترێ: پسپۆڕیی ورد (الإختصاص الدقیق).

٤ـ ئیجتیهاد بە ئیجتیهادێکی تر هەڵناوەشێتەوە، مەگەر ئەو ئیجتیهادە پێچەوانەی دەلیلێکی قەتعیی کیتاب و سوننە یان ئیجماع بووبێت. لەبەر ئەوەی ئامانج لە ئیجتیهاد جێگیربوونی یاسای شەرعە، بۆیە رێگە نادرێت کە قازیی بڕیاری قازییەکی تر هەڵوەشێنێتەوە، جگە لەو بڕیارانەی پێچەوانەی حوکمی قەتعین. ئەم باسە لە ناو ئوصولێییەکاندا، بە ناوی (لا ینقض الإجتهاد بمثله) باس کراوە.

٥ـ نابێت لەو مەسەلانەدا کە دەقێکی شەرعیی موحکەم واتە هەڵگری ماناو چەمکی قەتعیی هەیە، ئیجتیهاد بکرێت، چونکە بوونی چەمکی قەتعیی رێگا لە جیاوازیی بیر و بۆچوون دەگرێت و بوونی یەك مانای راستەوخۆش واتە مەبەستی شاریع روون و ئاشکرایە، هەر بۆیە زانایان فەرموویانە: لا إجتهاد في مورد النص.

٦ـ لە بواری فیقهو ئاکاردا موجتەهید یان راستیی دەپێکێت و دوو پاداشتی هەیە، پاداشتی ئیجتیهاد و پادشتی پێکانی راستیی، یاخود راستیی ناپێکێت و تەنها پاداشتی ئیجتیهادەکەی دەست دەکەوێت. ئەمە ڕای بەهێز و متمانەپێکراوی زۆرینەی زانایانە، واتە ئێمە باوەڕمان بە (تخطئة)ی موجتەهیدە، نەك بە (تصویب)ی هەموو موجتەهیدێك، ئەم

باسه له کتێبه ئوصولّییەکاندا به ناوی (التصویب و التخطئة) هاتووه، که هەندێك له زانایانی موعتەزیله بڕوایان وابووه که ڕاستیی مەرج نییه یەك ڕای دیارییکراو بێت، ئەگونجێت بابەتێك چەند حوکمی هەبێت و موجتەهید به هەر کامیان گەیشت ئەوه ڕاسته و پێویسته پەیڕەو بکرێت.

**تەقلید**

تەقلید له زمانی عەرەبییدا به مانای کردنه ملی ملوانکه و گەردنبەنده، بەلّام له زاراوەی عیلمی ئوصولّدا بریتییه له وەرگرتنی مەزهەبێکی دیارییکراو به بێ ئەوەی زانینی بەلّگەو بنەماکانی پێویست بێت، واته پەیڕەویکردن له فتوا و بڕیاری موجتەهید به بێ توێژینەوەی بەلّگەکانی.

کەواته تەقلید لەو هەل و مەرجانەدایه که مسولّمانێك خۆی پابەند دەکات به قسەی کەسێکەوه که ئەو قسەیه له خودی خۆیدا حوججەت نییه ئەگەر به بەلّگەی شەرعیی پشتڕاست نەبێتەوه.

له ئەنجامی ئەم پێناسەیه چەند خالّێکمان لا گەلّالّه دەبن:

١ـ وەرگرتنی وتەی پێغەمبەری خودا ﷺ نابێت به تەقلید، چونکه وتەی ئەو له خودی خۆیدا حوججەیەکی شەرعییه.

٢ـ پەیڕەویی له ئیجماعی زانایان نابێته تەقلید، چونکه یەکێك له تایبەتمەندییەکانی ئوممەتی ئیسلام ئەوەیه که نابێت پێچەوانەی ئیجماع هەلّسوکەوت بکەن.

٣ـ کارکردنی قازیی به شایەتیدانی شاهید نابێته تەقلید، چونکه شاریع ئەوی مولزەم کردووه به وەرگرتنی ئەو شایەتییه ئەگەر مەرجەکانی تێدا هەبوو.

٤ـ پرس و ڕاوێژی موجتەهیدین به پسپۆڕانی زانستەکانی دیکه نابێته تەقلید، چونکه ئەم پرس و ڕاوێژه بۆ خۆی مەرجێکه له مەرجەکانی ئیجتیهاد.

**جۆرەکانی تەقلید:**

کاتێك سەیری هەلومەرج و مولابەساتی تەقلید دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت که تەقلید دوو جۆره:

١ـ تەقلیدی پەسەند: که بریتییه له پەیڕەوییکردنی کەسی نەشارەزا له موجتەهیدی تەواوی خاوەنی مەرجەکانی ئیجتیهاد.

٢ـ تەقلیدی ناپەسەند و حەرام: کە بریتییە لە پەیڕەوییکردنی کەسی شارەزا لە شارەزا، یان شارەزا لە نەشارەزا، یان نەشارەزا لە نەشارەزا.

بەڵگەشمان لەسەر ئەم دابەشکردنە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ) (النحل : ٤٣)، واتە واجبە لەسەرتان ئەگەر زانیارییتان نەبوو پرسیار لە کەسانی زانا بکەن و بۆ لای ئەوان بگەڕێنەوە.

بە مەفهوومی پێچەوانە واتە ئەگەر زانیارییتان هەبوو پێویستتان بەو پرسیار و گەڕانەوەیە نییە.

لەناو زانایاندا ئیبن حەزمی زاهیری و هاوبیرەکانی، بە تەواوی تەقلیدیان بە ناڕەوا داناوە تەنانەت بۆ نەخوێندەوار و عەوامیش، لە ڕووی ئەم دابەشکردنەوە حوکمی تەقلیدیشمان زانی.

**سەرنج:**

بۆ ئامادەکردنی ئەم پەراوە سوود لەم سەرچاوانە بینراوە:

١ـ أصول الفقه الإسلامي في نسيجه الجديد نووسراوی پرۆفیسۆر دکتۆر موستەفا زەڵمی.

٢ـ مباحث کلامي در أصول فقه إسلامي نامەی ماستەری خۆم کە ساڵی ١٩٩٦ پێشکەشی زانکۆی تارانم کردووە.

٣ـ أصول الفقه الشيخ محمد الخضري بگ.

٤ـ الوجيز في أصول الفقه دکتور وهبة الزحيلي.

٥ـ جمع الجوامع في الأصول تاج الدين إبن السبکي.

# ناوەڕۆك

# بڵاوكراوەكانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیرە | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەیووبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |

| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
|---|---|---|
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلاmناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٧ | سـەيد قوتـب، لـە هاتنـەدنياوە تـا شەهيدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخاليدى<br>و: تارق نەجيب رەشيد |
| ٣٨ | عوسمـانى كـوڕى عـەففان، كەسـايەتى و سەردەمەكەى | ن عەلى موحەممەد سەللابى<br>و: حەميد موحەممەد عەبدوڵلا |
| ٣٩ | خوانى ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربـارەى گەورەيى و پيرۆزيى نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدى شەريعە |
| ٤٠ | ئەلفبێى لاتينى.. زمانى ستاندارد | ئامادەكردنى: رەوشت محەمەد |